# خوێندنەوەی کتێب

## ڕۆمان و چیرۆک
## کوردی - بیانی



جەبار جەمال غەریب

دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم

جەبار جەمال غەریب

# خوێندنەوەی کتێب

رۆمان و چیرۆک

کوردی - بیانی

سلێمانی ٢٠٠٢

ناوی کتێب: خوێندنەوە کتێب

ناوی نووسەر: جەبار جەمال غەریب

بابەت: لێکۆڵینەوە

تیراژ: ٤٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن : ٢٤٢ ی ٢٠٠٢

چاپ و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم

زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ( ١٦٩ )

# پێرست

**• رۆمان**



**• چیرۆک**

# گوڵی شۆڕان

گوڵی شۆڕان یان سووتانەکانی بانە و خەونەکانی کورد، یان ڕۆمانی دنیایەک خەم و کەسەری بێ بڕانەوە، لەبەرئەوەی ئەم ڕۆمانە کەم گەیشتۆتە دەستی خوێنەران، جیا لە نووسینەکانی دیکەم ناچارین کراوەتر بدۆیین و لە رایەڵەکانی تێگەیشتن و ناسینەوە دەست پێبکەین.

* یەکەم دێڕی ڕۆمانەکە، کە دەشێ دێڕی کۆتایی، یان فیکر ئامادەی سەرجەم بێ «لاس کوڕە گەورەی وسوو ئاغا دوای پانزە ساڵ و لە ساڵڕۆژی مەرگی خۆیدا گەڕایەوە».

ڕستەیەکی ئاوس بە گێڕانەوەی تەمەن، ڕستەیەک کە دەلالەتەکانی مەرگ و ژیانی هەڵگرتووە، ئەو ڕستەیە «لاسیکی» ئامادە لە بیرو ئەندێشەی خوێنەردا وەئاگادێنێ، ئەو لاسە یان ژیانی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە یان بەدوای ژیانی خۆی دەکەوێ. لە هەردووک حاڵەتەکە، ئێمە وەک لاس دەستە پاچەین و بەدوای گێڕانەوە دەکەوین.

* وەختێک دەگاتە نێو شار وەک کەسێکی «سەرلەنۆ غەریب» شار دەبینێتەوە، حاڵەتی ناوازەو تەپوتۆزی تەمەن لە ڕوومان دەپژێنێ، بەسڵی و عەشقێکی زۆرەوە دەچێتەوە ماڵ و ماڵێک «وەک مردوویەک وە ئاگابێنێ» ناچارە خۆ بەو ماڵە بناسێنێتەوە «من لاسم. کوڕی ئەم

ماڵە» ل ٩، دواتریش «گەڕامەوە دایە گەڕامەوە».

* بەڵێ لاس لە ساتەکانی مردنەوە هاتووەتەوە، لە نێو گۆڕستانەکانی تەمەن و مەنفایەکانی عەدەم سەر وەدەردەنێ. جێی خۆی پێ ناکرێتەوە.

* دووەمجارە لاس گیرۆدەی «نامۆیی» دەبێت، جارێک لە ڕۆژی لە دایک بوونیدا، وەختێک بابی ناوێکی بۆ لێ نانرێ و یان ناپەرژێتە سەر ئەوەی بیر لەوەبکاتەوە ئەو منداڵە ناوێکی پێ دەوێ و خاڵە نایەرێکی غەوارە دەڵێ

- «ڕەنگە ناوی لاس بێ» ل ٢٨.

دواتر وسوو ئاغا «بابی» تەسلیم ئەو ناوە دەبێ و لە قورئانەکە دەنووسێ «لاس.... تەمەنی درێژو بەرەکەتی ئەم قورئانە ڕێنوێنی ژیانی بێ» ل ٢٩.

ئەو ناساندنەی هەوەڵ جار، ناساندنی سبەینێیە بە دوێنێ، یان شاردنەوەی گەرایەکانی دوێنێیە لە جوانییەکانی سبەینێ. ناساندنی دووەم جار، ئەو وەختەی دەگەڕێتەوە، ناساندنی تەپوتۆزی مێژووە بە ئێستا، ئەوەش گرانترین و پڕ ئێشترین ناساندنە.

* لە جوانترین و تۆکمەترین سەرەتا کەسێتییە زۆر سادەکانمان پێ دەناسێنێ، ئەو «دایکە» پڕ ئەندێشە و سۆزو جوانییەی ڕۆژگار کردوویەتیە بەرد، بەرد بە تەواوی مانایەوە. دایە گوڵێ یان دایە بەرد هێندە بەسۆز نامۆیە نەک ئێمە نووسەریش بیر لە حاڵەتە خۆشەویستییەکانی ناکاتەوە، چونکە خوێندنەوەی دایە گوڵێ لە خوێندنەوەی بەرد قورسترە، کەسیەتیی دایە گوڵێ، مێژووی داخراوی کوردە.

* زمانێک دەبێ لەبەرد بێ، زمانێک دەبێ لە ئاگر بێ مێژووی پازدە ساڵەی «مەرگی لاس» بگێڕێتەوە. لاس بەدوای گوڵە ئەبەدییەکانی شۆڕاندا چوو بوو، لاس بە دوای گوڵە وهمەکانی هومێددا چوو بوو، نەک هەر ئەو گوڵانە لاس چوو بوو «بۆ جەرەیەک ئاو شاری پێ

بکوژێنێتەوە» ل ٧٩، ئەو شارەی کە هەمیشە گڕی لێ هەڵدەستێ، ئەو شارەی کە هەموو جەڕڕەکانی شکاون و ئاویان تێدا بەند نابێ.

* لاس بەبێ «جەڕڕەیەک ئاو» و لاس بەبێ «گوڵی شۆڕان» و لاس بەبێ جوانییەکانی تەمەن، لاس بەکۆمەڵە هومێدێکی بەسەرچوو بۆ باخچەکانی ژینی دەگەڕێتەوە، ئەو باخچانەی لەسەفەرەکەیدا لە دەستی داون. دووریی پانزدە ساڵ، گوڵی تەمەنی و گوڵە راستەقینەکانی وشک کردو کردنییە خۆڵ. سووتانی دووجاری شارو نێفۆڵ بڕینی کوردو هەرای عروس و جوولەکە و ئەرتەش نەیانتوانی لاس، ناخی لاس هەلا هەلاکەن و بیبەزێنن. پازدە ساڵ دەربەدەری مێژوو لاس و شاریان گۆڕی. ئەو مێژووەی لاس جارێکی دیکە جێگای تێدا نابێتەوەو ئەو شارەی جێگایەکی بۆ لاس تێدا نییە. ئێمە درەنگ زانیمان، لاس و هاوەڵانی لە شار وەدەردەنرێن تا ئەوانی دیکە بەئارەزووی خۆیان نەخشەی شارو نەخشەی ئینسانەکان بگۆڕن. دواتریش لاس خەونێک لە سبەینێدا نابینێ بۆی بژی.

* کەسیەتیی لاس، یان لاس بە هەموو بوونییەوە تەنیا بۆ ئەوە هاتووەتەوە تەپوتۆزی سەر ئەو راستییانە هەڵداتەوە کە بۆ ئەمڕۆ هیچ بەهایەکیان نییە. لاس هەیکەلی گێڕانەوەو رووداو و بازنەی کەسیەتییەکانی دیکەیە.

* خانزاد، وێنەی ئافرەتی کورد و مەینەتیی ژن، خانزاد دوای خۆشەویستییەکی سادە وەک بۆی رەسم کراوە دەبێتە ژنی «لاس»، ئەو چارەنووسەی لە نێو چاوانی دەنووسرێ، ناکرێ خۆی لێ هەڵبوێرێ، دەبێ هەموو جوانی و لەززەت و کایە مرۆییەکانی خۆی بداتە «لاس» و تاکە خۆشییەک بۆ خۆی نەهێڵێتەوە. ون بوونی لاس یان مردنی «لەکایەکانی ژیانیدا» ئەو چارەنووسەی خانزاد دەتەپێنێ و شەیتانە ئەزەلییەکانی ناخی ژن بە خەبەر دێن و بێ ئەوەی بتوانێ بەرگری بکات «ئەو داوێنەی کە دوژمنییەتی» سەردەکەوێ و دەیخاتە نێو گەمەکانی ژیان و خەتایەکانی فەرخەوە.

* فەرخە «کوڕی دووەمی وسوو ئاغا» دوای خەونە جوان و جیهانە پڕ رەنگەکەی دەگەڵ «لەیلای جوولەکە» و لەیلای عاشقدا، دوای پەنا پڕ مەستییەکانی و تێکشکانی هومێدەکانی نزیکترین ژن کە گوێی بۆ بگرێ خانزادە، ئەو دوو کائینە پڕ حەزو شەهوەت و تەنیایە، هەربۆیە پێکەوە دانراون تا خەتا بکەن و شەیتان بە خەبەر بێنن.
«ئەو رۆژە کە نیگای ترسنۆک و سلۆکی لە درزی دەرکەی ژێر خانەوە لەشی رووتی خانزادی دەدۆزی. خانزاد خۆی دەشت....
دیمەنێکی ئاگرین کە لەیلا و ئەشق و براو هەموو چەشنە ئەخلاقێکی لەگیاندا دەتواندەوەو ماڵەکەی پێ تاوان پڕێن دەکرد... لەوەبەدوا وەک ئەوە هەرگیز براژن و کەسی نزیکی نەبوو بێ...» ل ١٤٣.

* * *

* وەختێک لاس دەگەڕێتەوە جگە لە سووتانی پەرێزەکانی ژیان و جگە لە هەڵپڕووکانی هەناسەکان هیچی دیکە نەماوە.
* خوێنەر هەر لەسەرەتاوە هەست بەو وێرانەیە دەکات یان ئەو وێرانەیە دەبینێ لاس بۆ دەگەڕێتەوە.
* ئەو کەسایەتییانەی لەو رۆمانە بەشدارن هەریەکەو گرنگی و وجوودی بەتەنیای خۆی هەیە و کەسیان جێگای پشتگوێ خستن نین «لاس و وسوو ئاغا و دایە گوڵێ و خاڵە تایەر» نوێنەری ئەو دنیایەن کە ناگۆڕێ و بێ هوودە دوێنێ لە دوو خۆیان رادەکێشن و ئەورۆ نابینن.
* «خانزاد و فەرخە» رۆڵە ساتە زیندووەکانی زەمەن و لە حاڵەتە زەمەنییەکان دەگەن و ناتوانن دەست بۆ سێوە گەیشتووەکان نەبەن و لێگەڕێن مێژوو بیانڕزێنێ.
* «یادگار و هیوا» هومێدە بێ بەهاکانی سبەینێن، ئەو هومێدانەی جگە لە پەشموردەیی و یەئس هیچی دوێنێیان تێدانییە.

* * *

هەر لە دێڕەکانی سەرەتاوە، ئێمە بەرەو رووی دنیایەک دەبینەوە کە

زەمەنەکان تێیدا یەکتر نابینن و یەکتر ناخوێننەوە،
لاس دەڵێت:
- «گەڕاومەتەوە تاسەگی ولاتی خۆم پێم بوەڕن» ل ٧.
دایکی لاس کەموتوربەی دەلالەتەکانی دوێنێیە دەڵێت:
- «لاس هەرگیز ئاواتی ئەوەندە نزم نەبوو».
ئەو تێکنەگەیشتنە، تێکنەگەیشتنی دووزەمەنە لەیەکتری. دیسان دەبێ بلێین گۆڕان یان لەبەین چوونی خەونەکانی لاس، ئەو خەونانەی خوێنی مژیبوو، گۆڕانێ بە هومێدی سادە و هیچ، کە حاڵەتی نۆستالژ یا بنیاتی ناوە، زەمەن دەوری سەرەکیی تێدا گێڕاوە، لە کاتێکدا ئەو زەمەنە لە یەکێ لە رووەکانیدا لای دایکی «زەمەنێکی بۆگەنە» یان زەمەنێکی وەستاوە.
لە کاتێکدا لاس دەیزانی لای ئەو «زەمەنە» بەکاوەخۆ تێپەڕیو، بەڵام بیری لەوە نەکردبووەوە «زەمەن» لە شارەکەشی، لە ماڵی خۆشی، لەجەستەی ژن و منداڵی تێپەڕیوە، ئەوەش دەبێتە دیوارێک لە نێوان خۆی و دایکیدا، لە نێوان خۆی و شارەکەیدا، لە نێوان ئێستا و رابردوویدا، ئەو رابردووەی لاس لێی دەگەڕێ و بۆ دەژی و دایکی خۆی لێ دەشارێتەوە.
[ «دایکی دوێشەو میهرەبانتر بوو.» ئەوسا بەدزییەوە سەیری رووومەتی کرد. «چ نەفرەتێک لە گیانیدایە؟!» پێی وابوو شەیتان چۆتە بن کلێشەی، لەودیو ئەو لەشە پەککەوتەیەوە هەستی بەبوونی شەیتان دەکرد... تەشبیهێکی تر فریای کەوت. «لە قەلایەکی تەلیسم کراو دەچێ» ] گوڵی شۆڕان ل ٣٥.

* * *

دایکی بەقسەیەک هەموو هومێدەکانی لاس تێکدەشکێنێ کە دەڵێ:
- «هەر من و هیوا لە ژێر سێبەری ماڵی وسوو ئاغادا ماوین» ل ١١.
دووکەس، یەکەمیان: دایکی رەمزی کلتوور و مێژووی داخراو و

کێشە قورسەکانە.

دووەمیان هیوا: بەڵام هیوایەکی بۆگەن، هیوایەک کە جگە لە کرۆژتنی دەستی خۆی چیدی لەدەست نایە، ئەو هیوایە، بەڵێ هیوای کوردە.

* دەشێ جوانترین وەسفی «لاس، وەک هێزی بەرگریی کورد» ئەو وەسفە بێ کە دایکی بۆی دەکا.

- «کەس ناتناسێ. کەس بڕوا بەبوونت ناکا، لەهەرکوێ زیندوو بی، لێرە مردووی» ل ٣٢.

* وێنەو هەیکەلی کەسایەتییەکان زیندوو و بەرجەستەن، دەشێ «فەرخە، برای لاس» پانتاییەکی بەرینی داپۆشیبێ و نموونەی کەسایەتیی و ئاسوودەی" کوردە. هەموو رووداو و تێپەڕ بوونێکی رۆژگار کەسایەتیی فەرخە روونتر و کاملتر دەکات، خانزاد پەنهانەکانی رووحی فەرخە لە هەموان شارەزاترە لە رۆژانی سەرەتای مردن لاس و سەرەتای پێوەندییان پێی دەڵێت:

- چاوی حەزت بە ژنە کافران پشکوتووە. ل ٧١.

خانزاد بە وشەی «حەز» و «کافر» دەروونی فەرخە هەڵدەڕێژێ و رەنگی رۆژەکانی دواتر دەکێشێ. یان دەتوانیین بڵێین ئەوە «ئاگایی ناخی» خانزادە هەستە پەنهانەکانی ژنە قسە دەکات. فەرخە ئەو کەسایەتییە گرنگ و دیارەیە پارسەنگی رۆمانەکەی راگرتووە، هەرچەندە کەسایەتییەکی پەراوێز لە رۆمانەکەدا نییە گرنگیی پێدرا بێ، ئەو کەنجە حاڵەتێکی جنسیی نەهاتووەتە رێ لە کوفر دوور بێ، هەموو ئەو دایەلۆگانەی دەگەڵ خانزادی هەن قسەی دوو عاشقن و هەموو هەوڵی نووسەر نەیتوانیوە نێوانیان لەو کوفرە پاک بکاتەوە، تەنیا دیتنی خانزاد بەڕووتی تەقینەوەک دێنێتە گۆڕێ کە ناتوانین بڵێین رێڕەوی رۆمانەکە دەگۆڕێ، بەڵام رۆمانەکە بۆ رێڕەوی خۆی دەبا، چونکە ئەو گوناهە لە ناخی خانزاد دەم[illegible] بوو هەڵڕژا بوو لەو رۆژەوەی زانی دەبێ ئەو لەگەڵ «دوژمنێک» بەشەر بێت، ئەو دوژمنە

«شەیتانێکە» لەناخی خۆیدا:

- «لە پشتێن بەرەو خواری خۆی لێ ببوو بە دوژمن، بە سڵ و ترس و نەفرەتەوە سەیری دەکرد. دوژمنێکی ئەوەندە نزیک بریا بیتوانیایە لەبەری هەڵێ. بریا بیتوانیایە لە ژوورێک بەندی بکا و دەرکەی لەسەر گاڵە بدا. بریا بیتوانیایە رێگەی تەنیاییەکانی نەداو لەگەڵیدا نەچێتە ناو جێگەوەو لەگەڵیدا نەخەوێ» گوڵی شۆڕان/ ل ٣٢.

فەرخە بە کارامەیی شەیتانێکەوە کەڕای ئەو تاوانە زۆرزووتر لەدەروون و هەستی سادەی خانزاد دەچێنێ، هەر لەوکاتەوەی خەونە پیاوانەکانی خۆی و رابواردنەکانی دەگەڵ لەیلای جوولەکە بۆ دەگێڕێتەوە، ئەو خەونە پڕ خەتایانەی تەنیا لەباوەشی ژندا دێنەدی.

* * *

زەمەن: جگە لە هەستی زەمەنی باو «زەمەنی گێڕانەوەو زەمەنی رووداو و زەمەنی خوێندنەوە»کە ئێرە جێگای باسێکی وای تێدا نابێتەوە، بەڵام تەنیا لە زەمەنی گێڕانەوەدا سێ «زەمەنی» جیامان هەیە، هەرسێکیان لە نێو بازنەی رووداودا، هەرچەندە لەو جۆرە گێڕانەوەدا، نە زمان و نە زەمەن ناگەنە پلەی گەش کردن و سەربەخۆیی و ئازادییەک نابینن، بەڵام داگیرکردنی کاتێکی درێژ لە پانتایی رۆمانەکەدا یان خایاندنی رووداو لەسەردەمی جیاجیا، جووڵانێکی میکانیکیی بەزەمەن داوە.

* زەمەنی گەڕانەوە، یان زەمەنی دەست پێکردنی رووداو، کە تێکەڵەیان بەشێکە بە زەمەنی هاتنەوەی لاس، کە تەنیا زەمەنێکی تەکنیکییە و لەبن زەبری زەمەنی رابوردوو دایە یان ئەو زەمەنە بۆشەیە رابوردووی بەسەردا دەڕمێ.

* زەمەنی دوور، زەمەنی پێکەوە ژیان و مەینەت، زەمەنی گەڵاڵە بوونی هەناسە، یان دەتوانین بڵێین زەمەنی هاوبەش.

* زەمەنی ون، یان زەمەنی سەخت. ئەو زەمەنە زەمەنی ون بوونی لاسە، یان مردنی لاسە. لەلایەکی دیکەوە زەمەنی دەربەدەرییەکانی ژن

و لەزەتەکانی شەیتان و بە بەرد بوونی دایکە.

* * *

* ئەو رۆمـــانە لە هەشت بەش پێک دێت، لە نێـــوان بەشـــێک و بەشێکی دیکەدا لێک دابڕانێک لەزەمەن و رووداو کەسایەتییەکاندا نییە، بەشەکانی تەواوکەری (تەکنیکی) یەکترین.

* جگە لە بەشی هەشـــتـەم، هەر حـەوت بەشـەکـەی دیکە یەک گـێـڕەرەوەیان هەیە ئەویش دەنگێکە کـە هەمـوو زانراوو نەزانراوەکـان دەزانێ و تەنیا چاوەڕێی کاتێکی گونجاوە شتەکانمان پێ بڵێ.

* بەشی هەشتـەم، یان دوا بەشی رۆمـانەکە، یادگـار «کە یادگـاری لاسە» دوای لەدەست چوونی هیواکان و بە تالانبردنی رووبارەکانی ناخ و ون بوونەوەی «لاس، باوکی یادگـار» زۆر بێ دەربەسـتـانە رۆژەکـانی گەڕانەوەی لاس دەگـێـڕێتـەوەو لە خۆی رانابینێ نەمامێک لە جێگای دارتووە سـووتاوە بچـەقـێنێ، ئەوە هیچ هومـێـدێک لە هیـوا «کـوڕە بچووکی وسوو ئاغا» نییە، نووسەریش سێبەری ماڵی وسوو ئاغای بێ دارتوو هێشتووەتەوە. ئەو بەشەی رۆمانەکە، پەڕاگەندەی مێژووە، هەر لەو بەشەشدا «لاس» وەک هەر ون بوویەک، یان وەک هەر مێژوویەکی ون، لە گـوندێکی لاچەپەک دەنێـژرێ، بێ ئەوە بزانن ئەوەی دەینێـژن فیداکارییەکانی، هومێدە بەسەرچووەکـانی کوردە، تەنیـا ئەوەندە کە رابوردوویەکە و دەبێ بشاردرێتەوە.

* * *

ڕاســتــە -نووســەر- تەنیــا بەشی هەشــتــەمی داوەتە -یادگــار- بیگێڕێتەوە، هەرچەند هەر بەهەمان زمان و ئیحساسی بەشەکانی دیکە نووسراوە، ئەوەش تەنیـا تەواوکـردنی هارمۆنیـای گشـتـیی نووسـینە. بەواتایەکی دیکە بەشی هەشـتـەم، هەسـتـانە سـەر پێی یادگـارە، نووسینەوەی نیگایەکانی خۆیەتی یان دوابەش، بەشی مردنی باوکە.

دەتوانین لەو تێبگەین کە لاس لە پشت گێڕانەوەکـانی هەر حەوت بەشەکەی دیکەیە، بەڵام وەختێک لە کۆتایی بەشی «حەوتەم» ڕۆحی

دەتەپێ و بە فعلی دەمرێ، چیبدی گاڵتە بەبرینەکانی خۆی ناکات و دەڕوا «بۆ ئەوەی بمرێ» ل ١٥٩.

گوڵی شۆڕان دەچێتە نێو خانەی ئەو ڕۆمانانەی کە دەشێ سیماکانی کۆمەڵگە لە نێو دێڕەکانی بناسرێتەوە یان ببێتە بەڵگە بۆ خوێندنەوەی مێژوو «ڕابردوو»، هەرچەند مێژوو بە حەتیمییەتی خۆی لاپەڕەکانی دوای بەشی چوارەمی کاڵ کردووەتەوە، چونکە لە دوای بەشی چوارەم نووسەر کەوتووەتە نێو گێڕانەوەیەکی قورس و یەک ڕوو، بازنەیی کە توانا قووڵەکانی خوێندنەوەی ناخی کەسەکان و مردنی هەناسەکانی لێ ستاندووەتەوە. هەرچۆنێ بێت قەڵەمی ڕەنگینی -نەهایی- ناچارمان دەکات بە عەشقەوە گوێ بۆ سووتانی شار و هێرشی عەشایەر و کێشەکانی بگرین. دیسانەوە بەڵێ بۆ ڕۆمانی کوردی.

# ئێوارەی پەروانە:
# نووسینەوەی هەستەکانی با

«ئێوارەی پەروانە» دوا رۆمانی نووسەری بە توانا (بەختیار عەلی)یە، لە ماوەیەکی زۆر کورت نووسراوە، ئەویش نۆ مانگە، ئەگەر ئەوە لەبەر چاو بگرین کە رۆمانەکە (٢٥٥) لاپەڕەی مامناوەندییە.

ئێمە ناچینە نێو وردەکارییە پڕ ئەندێشەکانی ئەو رۆمانە تەنیا داوە سەرەکییەکان و هەیکەلی گشتی ئەو رۆمانە دەخوێنینەوە.

لە یەکەم دێڕەکانی سەرەتاوە لە دەمی «خەندانی چکۆلە» خوێنەر دەگاتە ئەو راستییەی کە هەموو ئەو شتانەی دەیخوێنێتەوە، کە هەموو ئەو دنیایەی چاوەڕێی دەکات، بە رووداوی واقیعی و خەیاڵییانەوە، بە وەهم و خەونیانەوە، شتی بەسەر چوو و تەواوو بوون، شتی نێو مێژوون، دەفتەرەکانی یادگارن، رووداوەکانی دوێنێن. هەر ئەوەشە، ئەو هەموو دێڕە رەنگین و پتەوانە، ئەو هەموو فەلسەفەو ئەندێشانە، ئەو هەموو نەزیفی خوێنە، ئەو ئەڤینە مەزنە راچەنینێکی زیندوو، کەفو کولێکی گەرم و راستەوخۆ لە خوێنەردا ناخولقێنن.

ئەوەش دەمانباتەوە سەر ئەو سەرە داوانەی لەوەبیر هێنانەوەی ئەو خاڵەدا شوێنکاریان هەیە. لە دەست پێکردنی هەموو رووداو یان فەنتازیا یان خەون، یان گێڕانەوەی واقیعێکی نوێ، هەر لەیەکەم

رستەوە، دوا دەرەنجامان دەگاتە دەست. ئەوەش وەک بنیات و بناغەی رۆمانەکە مامەڵەی لەگەڵ کراوە. هەربۆ نموونە
: لەسەرەتاوە دەزانین پەروانە مردووە.
: «خەندانی چکۆلە» لە دوای هەموو موسیبەتەکان دەگەڕێتەوە لامان.
: لەگەڵ ون بوونی «نەسرەدینی بۆنخۆش» وەک، برادەرەکانی دانا چلەکێین چونکە لای ئێمە هەمیشە ئامادەیەو لە بازنەی گێڕانەوەکە دانا بڕێ....تاد.
ئەوەش بەگەڕ خستنێکی چەند دیوە، چەکێکی چەند سەرە.
١- لە لایەک چیرۆک یان رۆمان تووشی وەستان و دامان دەکات و خوێنەر چاوەڕێی شتی نوێ ناکات و دەکەوێتە نێو گوێگرتنێکی مەحتوم، وەک مێژوو.
٢- لە نیکایەکی دیکەوە، سەرەڕای وەستانی رووداو، بازنە بە دەوردا کێشانی جووڵەکانە نووسەر توانای بێ سنووری دەخاتە گەڕ بۆ سەرسام کردن و فڕێدانی خوێنەر بۆ دنیا فەنتازیاو دەهالیزەکانی وەهم و شەوە تووش و خۆشەکانی خەون.
تاکە چەک بەدەست نووسەرەوە لەو جۆرە تەکنیک و هەیکەلەدا. توانای نووسەرە بەسەر زمان و فەنتازیاو چۆنیەتی گێڕانەوەو بۆ چوونیەتی لە بەرانبەر ئەو شتانەی کە رابردوون و بەزیندوو راگرتنیان.
٣- لە جوانترین حاڵەتدا دەتوانرێ وەک زەنگی راکێشانی خوێنەر تەماشا بکرێ.

* * *

## لە نێوان واقیع و خەوندا

قەڵەم ئەوەندە باریکە جێگایەک بۆ سنوورەکان نا هێڵێتەوە، هەوڵی مرۆش تەنیاو تەنیا پەلە قاژەی لە نێو چوونە، مرۆ وەختێک لەسەر ئەو بەردە هەسانەی دنیا لە تۆز زیاتر نییە، خەون و خەیاڵەکانی وەک دوا

مەنزڵ بەسیحر هەڵدەواسێ، بە نیازی مانەوە دامەنی دەگرێ، سیحر بە جۆرێک بۆتە واقیع کە داگیری کردووە. ئەو تێکەڵییەی خەون و ئەندێشەو واقیع لە جوانترین وێنەدا.

لێرەدا هاتۆتە سەرێ، ئەوەش لە سەرتاپای رۆمانەکە رەنگی داوەتەوە.

بەڵام کاکڵ، ئەو قسەی دەبێ بکرێ ئەوەیە....

ئەو دنیا پڕ لەخەونە چ خلودێکیان دروست کردوە؟

ئەوەش ئاڵقەیەک لەو بازنەیە بەتاڵ دەکاتەوە کە واقیع و خەون دروستی دەکەن.

بەستنەوەی چیرۆکەکە بەو هەموو رایەڵە «واقیعییە رووتانەی رۆژانە» کارەکە تا رادەیەک ئەستەم دەکات، یان بەستنەوەی رۆمانەکە یان چیرۆکەکان بەو سەرەداوە واقیعییە رووتانە ئەو حەقە دەداتە خوێنەر داوای تەواوی سەرەداوەکان بکات و نووسەر بخاتە خانەی پرسیارەوە، ئەو پرسیارانەی نووسەر لە بالایی کارەکەی نا ئومێد دەکەن.

هەر بۆ نموونە خوێنەر چەندان جار لەوە ئاگادار دەبێ کە «راستە مەعسوم مردوە» بەڵام تاکە کەسییەتی «جەنگەڵی شەهوەت»ە دەگاتە لامان و تادوا دێرەکانیش ئامادەیی هەیە و ئاڵقەی ناوەندی رووداوەکانە، جا خوێنەر کارێکی بەوە نییە کە دوای تەواو بوونی رۆمانەکە بەچ مردووە، گرنگ ئەوەیە لە رێڕەوی رووداوەکان ئەو مردنە چ کارێک دەکات.

* * *

## ناوەکان

دەکرێ خوێندنەوەیەکی سەرتاسەری بۆ ناوەکان بکرێ، ناونان ئەو هونەرە بەرزەیە کە نووسینەوەیەکی نوێی رووداوەکان و کەسییەتییەکانە. لێرەدا ناونان لە جوانترین حاڵەتدا بەکار براوە،

کەسیپەتییەکان بەناوەکانەوە دروست بوون، ئەوەش لەوەوە هاتووە کە ناوەکان تەنیا ناوی راگوزاری نین و نەخشی سەربەردن.

لە نەسرەدینی بۆنخۆش و فەرەیدوونی مەلەک و گۆڤەندی پەیکەرتاش و شەهلای خودا ناس و تادەگاتە عەزیزی تیر ئەندازو مەهدی گوڵەباخ و سیامەندی باڵندەو تاهر تووتی و....

من دەکرێ ئەو نێوانە وەک ناوی سەرکەوتوو و پڕ سەلیقەو بەشێک لە شەخسییەت و بەردی بناغەی ناسینی کەسەکان وەرگرم.

بەڵام لێکچوونی ناوەکان لە داڕشتندا، لێکچوونی ناوەکان لە هەڵگری حاڵەتەکانی وەسف و لێکچوونی ناوەکان هەتا لە مۆسیقاو تۆنیش،...

جۆرە شەفافییەک و ڕاڕایی و تێکەڵییەک لای خوێنەر دروست دەکات هەندێ جار دەگاتە ئەو رادەیەی کە وەک ناوی ئاسییان لێبێت یان بچنە خانەی خەیاڵی شاعیرەوە.

* * *

## سوانی پەپوولە

- فەریدوونی مەلەک، دەشێ یەکەم کەس بێ دوای پەپوولەکان کەوتبێ و شێتانە کۆیان بکاتەوە راویان بکات، یەکەم یادگاریشی بۆ پەروانە «کە تاکە ناوی بێ وەسفە» کتێبێکی پڕ لە پەپوولەیە، دوا وێنەی فەرەیدوونیش ونبوونیەتی لە دەریاو کێڵگەو مەتحەفی پەپوولە زێڕین و سەد رەنگەکان.

- عەشقی پەروانە بۆ پەپوولە ئامادەیی پەپوولە لە گیانی دا.
- خەندان و پەپوولە زیندووەو خەیاڵییەکانی.
- فەتانەو راوە پەپوولەکانی و کۆکردنەوەیان.

دووبارە بوونەوەی تاڕادەی سوان لەبەکاربردنی پەپوولە وەک کەرەسەی سەرەکی.

بەکار بردنێکی تاڕادەیەک یەک «بوعدی» هەموویان یەک جۆرە

عەشقی پەپوولەن ئەوەیشی «عەشقی کوشتنە» ئەوەش پەروانە وەک کەسییەت و پەپوولە وەک رەمزو خولیا لە بازنەی مەرگدا دەهێڵێتەوە.

* * *

## دەفتەرەکانی میدیای غەمگین

جگە لەوکەسە سەرەکییانە کە هەریەکەیان بۆ هەیکەلی گشتی رۆمانەکە زۆر پێویستن، «دەفتەرەکانی میدیا» «جیا لە میدیای غەمگین» وەک کەسێکی دیارو بەدەسەڵات دیوارێکی بەرزی ئەو رۆمانەیە، توانراوە تا دوا پلەی تەکنیک وفکر ئەو دەفتەرانە بەکارببرێن.

- وەک تەواوکەری گشتی رووداوەکان، ئاڵقە ونەکانی بەسەرهاتەکان، وەک گرێدان و پێکەوە بەستنی کارەکان و کردنەوەی بارە عاسێکان. ئەو دەفتەرە ئامادەیە.

- لەلایەکی دیکەوە وەک کەرەسەیەکی عەشق و بڵندگۆی میدیای لاڵە.

* * *

## پەیامی نووسەر

ئێمە نەماندەویست بچینە نێو راگەیاندنی هیچ پەیامێکەوە. نووسەریش لە هەیکەلی گشتی رۆمانەکە ویستویەتی لە حاڵەتی «پەیام» دەرباز بێت و بەهێڵەکانی سۆزو هەست و حاڵەتە بێ وێنەکان بپەڕێتەوە ئەودیو. لە گومان و راڤەکردن و ئیرشاد وەک «دەسەڵات» دوور بێ. بەڵام سێبەرە تۆخ و بانگەشە بەردەوام و لێکچووەکانی دەروون و هەستی ئەو دیوی کەسە سەرەکییەکان «لە بۆنخۆش و پەروانە و فەریدوونی مەلەک و خەندان و فەتانەو هەتا زینەبی کوێستانیش» پەیامێک، رازو ئیرشادێک دەگەیەنن. بیردۆزێک راڤە دەکەن، لە کۆڵانە هەرە تەنگەکانی ئیمان و تۆبە دەردەکەوێت و خۆی دەسەپێنێ.

یان/ دەسەڵاتی پەیامێک، فکرە، بیرێک کەسە سەرەکی و لاوەکییەکانی وەک یەک گەمارۆداوە، هەرچەندە هەوڵێکی جدی داوە بۆ بزرکردنی ئەو پەیامە.
- ناچارین بۆ سڕینەوەی ئەوانەش، پەنا بەرینە بەر تەکنیک و رەسمی گشتی و رای سەرتاپاگیری رۆمانەکە، ئەویش مامەڵە کردنە لەگەڵ ئەڤین لە ناو ئاگر، بنیات نانی ئیمپراتۆری ئەڤینە لە بەردەستی عفریت. بۆ ئەوەش نووسەر ناچارە پەنا بۆ ئەو دەسەڵاتە بەرێ و تۆوی ئەو ئەڤینە پڕ گومانە لەنێو کەسەکاندا بچێنێ یان بەواتایەکی گونجاوتر بۆ ئەو کەسانە بگەڕێ ئەو تۆوەیان تێدایە.
ئەو پەیامە دەشێ پەیامی عەشق بێ، لە وەرزی عەشقدا، دەشێ پەیامی جنس و سەربڕین بێ، لە وەرزەکانی زووتردا، دەشێ پەیامی فەنابوون بێ، لەوەرزەکانی کۆچ و خەزانی ئەڤیندا.
ئەگەر هەموو ئەوانە خۆ دزینەوەیەک وجێ گۆڕکێیەکی تێدا بکرێ لە گەیاندنی پەیام و دەسەڵاتی نووسەر و دابەشکردنی بەسەر کەسەکان، ئەوە لە دوا بەشەکانی و لەرایە کاملەکانی خەندانی چکۆلەو راگرتنی زینەبی کوێستانی لە ئاستی خۆی بانگەشەی تەواوی دەسەڵاتی نووسەرە. لە گەشترین و دیارترین رستەشدا
- «من تەنها یەک کوفر دەبینم، ئەو کوفرەش بچوککردنەوەی یەزدانە بۆ یەک واتاو یەک وتەو یەک مانا.»
- «تەنها کەسانێک کەدەبێت تۆبە بکەن، ئەوانەن کە خودا بۆ ئەزیەتکردن و بەنەفرەتلێکردنی مرۆڤانی دی بەکار دەهێنن.»
وەختێک خەندان دەیەوێ دیدی خەڵک و تۆ بەکاران بۆ خوا بگۆڕێ. ئەوەش ئەنجامی ئەو هەوڵ و کۆششە نەپساوەیە لەبەرەبەیانی عەشقەکانەوە تا دوا ئێوارەی پەروانە درێژەی هەیە. کە دەشێ ئێمە رۆمانەکە بە «دوا ئێوارەی پەروانە» ناوبەرین بەپێی بنیات نانی ناوی رۆمانەکە لەسەر رووداو وەک نووسەر مەبەستیەتی.

* * *

## دوا وته

* بە پێچەوانەی ڕای باو، ئێمە لێرەدا هیچ شتێک بە واقیعی سیحری یان ئەفسانەیی نابینین، توانای گەورەی نووسەر لێرە لە خانەکانی خەون و ئەندێشەو بورجەکانی خەیاڵدا کاری کردووە، جگە لەبەستنەوەیان بە واقیعی ڕووت.

* دەکرێ ئەو بەردە بلەقێنین و بڵێین؛

کەڵەکە کردنی ڕووداو بارە فکری و نەفسی و خەونە دژوارەکان لەسەر تاکەکەس میزانی دنیا لەق ناکا!

* لەو ڕا ڕاگوزارییانە تەنیا چەند وشەیەکی بروسکەیی و بەپەلەما لەسەر ئەو ڕۆمانە نووسیوە، بەو نیازەی پەرە نهێنییەکانی زیاتر بخوێنینەوە. دەنا بەکاربردنی زمانی ڕووداو، وەرزەکانی ئەڤین، قۆناغەکانی تۆبە کردن و پاک بوونەوە، هەڵدێری زینا، کە ژاوەی ئیمان، جگە لەیەکەیەکەی کەسەکان شایانی لەسەر نووسین و لێوردبوونەوەو لەسەر وەستانن.

بەو نیازەی ئەو چەند وشەیە وەک هەستەکانی «با» وەربگیرێن.

# ئاوێنە سەرابیەکان
# ڕۆمان لە خانە دیلەکانی مێژوودا

کەس لەوە لامل نیە کە ئێمە کەوتووینە سەرەتاکانی دایەلۆگ لەگەڵ دونیا، بە زمانێک لێک حاڵی بین، دەشێ وەختێ ئەوە هاتبێ بڵێین ئەدەبی کوردی بەتایبەتی «پەخشانی، بەچیرۆک و ڕۆمانیەوە» خەریکە لە خانەکانی دیلی دێتەدەرو دوای هەناسەکانی پشوو، دەیەوێ شەرم و ترس و باڵق بوون و شەوانی خۆی بگێڕێتەوە، ئەوەش بەو مانایەی کە ئێمە سەرەتا وەکو کورد و دواتر وەک نووسەر لە حاڵەتێکداین، پێویستە بێ پاڕانەوەو کڕوزانەوە خۆمان بگێڕینەوە، گێڕانەوەیەک لە ناسوودەییمان کەم ناکاتەوە، گێڕانەوەیەک لە زینداندا نەبێ و بوونی ئێمە وەک مرۆڤ و نەتەوە بگێڕێتەوە، کولتوورو ئەفسانەو سیحری بوونی گەلێک ئەوەندەی دەکرێ لە پێستی کەسێکدا جێگای بێتەوە.

* کە دەڵێین: «خانەکانی دیلی» ڕاستە بەشێک لە مانەکەی دیلی چیرۆکی کوردییە بەو شکل و شێوەی کە هەیبوو، بەڵام مەبەستی سەرەکیمان، بەشی هەرە زۆری «دیلی» چیرۆکی کوردییە بەو «مانا تەواو بوانەی» کە دەبوو بیانگێڕێتەوە، ڕاستە ئەو «مانا تەواو بوانە» کرداری تەواو بوون و چیرۆک یان ڕۆمانی کوردی هیچی تازەی بۆ ناخرێتە سەر، لە نیگایەکی دیکەوە هەر ئەو ماناو کردارە تەواو بووانە

گەلێکیان دەهاڕی و میللەتێکیان دەکوشت، ئەوە حوکمی مێژوو بوو، مێژووی ئیسلام و مێژووی خۆرهەڵات و خۆرئاوا «بەمانا کولتووریەکانیشیانەوە» کە دەبوو ئەدەبی کوردی وەک «تاکەکانی» تەنهاو تەنها مردنەکانی خۆی کاوێژکاتەوە یا تەنها چوار مێخەکێشانی نەتەوەیەک راڤە بکات.

- دەکرێت من ببمە باوکی شەهیدێک، نازانم شەهید بە مانای چی؟ بە مانای پیرۆزی... یان بە مانای چوونە بەهەشت.... یان زیادبوونی ژمارەیەکی دی لە قوربانیدانی حیزبێک «ئاوێنە سەرابییەکان ل٨٦»

* «خانەکانی دیلی» کە ئەدەبی بەرگری تێیدا لە دایک بوو ئەو جوغزە یان بازنە رەنگین و سوورەی شۆڕشگێڕی و رەشی ماتەمی و شینەی دەربەدەری کە ئەدەب نەیتوانی بەبێ بازدانێکی سیاسی لێی دەربازبێ و دونیا ببینێ، ئەو تاک بابەتی و تاک رەهەندییەی دونیای ئەدەب کەسیەتی کوردی نابووت و کەنارگیری کردوو ئەدەب نەیتوانی بازنەکانی کەسیەتی تاکی کوردی ببڕێ و بچێتە ئەو دیو هیوا باڵاکانی نەتەوەو بازنە تەسکەکانی ببڕێت و وەهمەکانی کەسی کورد وەک تاک بنووسێتەوە.

«ئاوێنە سەرابییەکان» لەو خانەی دیلیەدا نووسراوە، دیلی نەتەوەو دیلی مێژوو قەدەرە، دیلی چیرۆک و شێواز، بەڵام بەقەڵەمێک کە دوای دیلیەکە پشوویەکی داوەو خەونەکانی وەک سکاڵاو پاڕانەوە نیە، خەونەکانی دایەلۆگی بوونی «مەخلوقاتێکە» لەگەڵ دونیاو رسواکردنی ئەو قەدەرەیە.

* ئەو رۆمانە کە دەشێ ناوی «بورجەکانی ئاوێنە» یان «بورجە سەرابییەکان» بایە لە پازدە بەش پێک دێت و هەموو بەشەکانیشی کارسازانە نێونران، بێ سەمەر نییە کە هەموویان وشەی «بورجیان» لەگەڵە، کە مانای ئەو بوورجانەش دەدا کە نەخش کراون و لە دەستی ئێمە دانین نەیان خوێنینەوە، هەر وەک چۆن «Fate- قەدەر» سەردەمانێک لەنێو ئەدەبی یۆنانی و دواتر ئەورووپیی مامەڵەیەکی بێ

دەسەلاتانەو دواتر تەسلیم بوانەی لەگەڵ دەکرا ئەویش ئەو رێکەوتەیان قەدەرەبوو کە پاڵەوان بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی لەو قەدەرە رزگاریی یان پشت گوێی خات، سەرەڕای ئەوەش کە هەر لە سەرەتاوە پاڵەوان یان کەسەکان لەو قەدەرو رێکەوتانە ئاگادارن و هەموو هەوڵێکیان بۆ رزگاربوون لێیان یان تەجاوز کردنیان زیاتر لە حەتمیەتی ئەو قەدەرەیان نزیک دەکاتەوە.

* بێگومان ئەو لێکچوونە هەر لێکچوونی قەدەرە، ئێکچوونی ژوورە پەنهانەکانی هۆشە، لێرە لەو ئاوێنە سەرابیانەو لەو بورجی نەهامەتانە قەدەر چییە؟ ناکرێ دونیا خێزانێک یان کەسێکی خەباتگێڕ بە مانا کۆنەکەی بکێڕدرێتەوە، خۆمان لە دەهالیزەکانی بەندیخانەو رۆژە چلکن و پیسەکانی بەلام خۆشەکانی منداڵی و مەحروومیەتی گەنجی و باڵق بوون بپارێزن، ئەوانە قەدەری هەموو لاپەڕەکانی نەتەوەن، قەدەری رۆمانی کوردی هەمان قەدەری دیارو هەستپێکراوی تاکەکانیەتی.

* ئێمە ئاوێنە سەرابییەکان لە هیوا قادر جیا دەکەینەوەو وەک بابەتێکی دیکەی بوونی کورد دەیدوێنین، ئاوێنە سەرابییەکان، وەک بابەت، گێڕانەوەی شەکەتیەکانی نەتەوەیە بەدەست «قەدەرێکی زاڵمەوە» لەو گێڕانەوە دەچینە نێو وردەکارییەکانی خەڵک و پێکهاتەی گەل و گوزەرانی رۆژانەو، بێگومان ئەو بونیات یان تانوپۆی گشتییە، کەسەکانیش لە «جەعفەر و کەریم و سەمەد و کانەبی و مروەت و خاجیان و مینا» وەک جەستەو نموونە بۆ ئەو گێڕانەوانە پێویستن، ئەوانە سووتەمەنی رۆمانەکانن نەک مەبەست «هەروەک چۆن سووتەمەنی سەر سەختییەکان بوون، لە لەیەکچوونێکی ساتیردا دەتوانین بڵێین، کەسیەتی کورد چ لە چیرۆک و رۆماندا چ لە ژیانی واقیعی خۆیدا ئەو داوڵەیە هەمووان تیر ئەندازی لەسەردەکەن.

«پیاوەکە باوەشێکی بە مروەتدا کردو قنج لەسەر کورسیەکە دایناو سەری پێ بەرزکردەوە بۆ ئاستی ئەو جەستە رووت و قووتە سەرەو ژێر هەڵواسراوەی کە بەزنجیرە شۆڕبوەکانی میچی ژوورەکەدا

.هەڵواسرابوون.» ئاوێنە سەرابییەکانی/ ل١٤٥

* بەهۆی راڤە جوانەکانی ئەم رۆمانەوە دەچینە ناو حەقیقەتێک و بۆ وەڵامی پرسیارێکی باو «بۆچی دروست بوونی کەسیەت لە رۆمانی کوردیدا نییە؟».

دەڵێین: هەموو ئەو رۆمانانەی لەسەر ئەنفال و بەرگری و شۆڕشەکانی کوردنووسراون، تێیاندا، هەموو تواناکانی نووسین، لەشێوەی گێڕانەوەو دایەلۆگ و زمان و هەتا خودی کەسیەتیەکانیش تەنهاو تەنها ئەداتێک بوون بۆ راڤە کردن و گیرانەوەی کارەساتەکان. واتە نووسەری کورد هەوڵی گێڕانەوەی «کەسیەتیە تاکەکان» نادات.

تەنها دەیەوێ «بابەتێک. یان بەسەرهاتێک» بەهەمووی قورسی خۆیەوە لە رۆمانێکدا جێ کاتەوە و کەسەکانی بەو باسانە بارکات. دەشێ لەوە بگەین کە ئەنفال و راپەڕین و شۆڕش بە رۆمان ناگێڕدرێتەوە، تەنها نووسەر دەتوانێ کاریگەری ئەو کارەساتانە لەسەر کەسیەتی کورد وەک «هەبوویەک» پیشان بدات. ئەوا ئەم رۆمانی «ئاوێنە سەرابیەکان» ناگرێتەوە بەڵکو بەشی هەرە زۆری ئەو رۆمانانە دەگرێتەوە کە بۆ ئەو مەبەستانەی سەرێ نووسران.

* جگە لەوەی کە هەموو بورجەکان رۆمانەکە تەواودەکەن، دیسانەوە هەر بورجە دەکرێ بە تەنها وەک چیرۆکێکی سەربەخۆ بخوێندرێتەوە.

* بورجی یەکەم، بورجی ئاوێنە، پێگەی رۆمانەکەیەو هێندەی بکرێ خوێنەر لەنێو تان و پۆی ئەندێشەکاندا ون دەکات سەرەداوەکان دەداتە دەست. بە بەدیارکەوتنی جەعفەری قۆڵبڕاو و حەزە مندالیەکانی و سەرەتاکانی فامکردنەوەی و حەمامی ژنان و حەمامی دوای زیندان و ئەشکەنجە.

* بورجی بووکە پەڕۆینە: دنیای پەنهانی مبنای ناتەواو خاچیانی غەریب بە خەڵک و دین، لەوە دەگەین. لە دوای هەموو کارەساتەکان و رمانی زەمەن مرۆ لە بووکە پەڕۆینەیەک زیاتر نیەو لەویش زیاتر جێناهێڵێ.

بورجی لافاو، هەموو بوعدەکانی لافاو، هەموو لافاوەکان، لافاوی قلّیشانەوەو لافاوی «ئاو»و، لافاوی خوێنی رەشی ئەمنەکان و لافاوی خوێنی بێ گوناحی کابرای عارەبانچی. لەسەر رێوە دەڵێن «ئەو عارەبانچییە نوێنەری تاکی کوردی سەرجادەکانە کە تەنها بەشی قوربانی بوونی حەقی دراوەتێ وەک وێنەیەکی پڕ سۆزو زیندوو دەمێنێتەوە» دەکرێ بڵێین ئێمەی نووسەرانیش حەقی ئەومان خواردووە، چونکە لە شۆڕشی «ئێمە دانییە» و قوربانی قەدەری ئێمەیە.

* بورجی لەق لەق/ بەشی سێیەم یان چیرۆکی سێیەمی رۆمانەکەیە، بەرێکەوت و لەخۆوە ئەو ناوە هەڵنەبژێراوە، لە چەند بوعدێکەوە خوێندراوەتەوە.

یەکەم: لەق لەق

بۆ خۆی لوغزێکی میللیەو بەشێک لە نهێنی و تۆزێک لە ئەفسانەی تێدایە.

دووەم باوکی بە سەمەدە لەق لەق ناسراوە «ئەمە گۆڕی» سەلیمی باوکمە... دواتر لەژێر لێوەوە دەیگوت کە بەسلیم لەق لەقی چەوو لم فرۆش ناسراوە» ل(٣٧)

سێیەم: سەلیم دوای ئەوەی گوایە نەجمەی ژنی لەدەست دەکوژرێ، تووشی گومانێک دەبێ کە ئازاری «تاوان» لای دروست کردوە. «سەلیم یەقینێکی ئەوتۆی لە لادرست بوو بوو کە ئەو حاجی لەق لەقە روحیانەتی نەجمەی ژنیەتی.» ل(٤٥).

ئەوە جگە لەوەی کە حاجی لەق لەق بۆتە رەمزێکی مزگەوت. «حاجی لەق لەقەکەش لەسەر منارەکەوە باڵەکانی لێکنان «دەبێ لێکدابێ» و هەڵفڕی.»

سەرەڕای تەواوکردنی ئەلقەیەکی دیکەی رۆمانەکە «لە رووداو»، لە پەراوێزەوە لەوەدەگەین کە «کوشتنی ژن یان لە دەست کوژرانی ژن» لای ژن خۆی دژەکردوەیەکی نییە و تەنها پیاوانی کەڵەگا خەمی ئەوە

دەیانگرێ کە «خەسارەتی ژنێکیان داوە.»

* بورجی مەرگ و بورجی نسکۆ دەکرێ لەیەک گۆشەنیگاوە بخوێندرێنەوە، ناوەکانیشیان یەک دەلالەتیان هەیە، مەرگی کانەبی رەنگدانەوەیەکی راستگۆیانەی دڵسۆزی سادەی حکوردە دوای نسکۆ، ئەمجارەش فریویاندایین. بورجی مەرگ- ل ٥١).

(نەهاتە ئەزبەنی، چیمان لێهات، دۆستەکانمان.. فریویان داین!؟)

بورجی هەرەس لە (٦٨)لێرە توانەوەی مێژوو لەناو تاکەکانی کورد دادەبینین، یان دەگەینە ئەو یەقینەی «ئەگەر یەقین» نەبێ وەهمەکەی» کە مێژوی کورد بێجگە لە وردەکاریەکانی (وەک سووتەمەنی) هەرگیز کورد بۆخۆی خاوەنی نەبووە، ئەو مێژووەیان ئەو قەدەرە وەک نەخشەیەکی تەواو ئامادە بەسەر کورد داسەپاوە، کوردی مەحکومیش تاکە ئومێدی لەو هەموو شۆڕش و خوێنانە تەنها هەوڵی «مانەوەی هەناسە بووە» دەنا بە دەستهێنانی ماف و گیان و دەوڵەت و سەربەخۆیی ئەوە جێگایەکیان لە بوونی مێشک و یادەوەری کوردانەبووە.

* بورجی ئەزبەنی و دارمانی بورجەکان «٣»: ئەو دوو بورجە جوانترین و رەنگینترین بەکاربردنی زمانە، وەک جەستەیەکی سەربەخۆ، جوانترین یادەوەری و جوانترین حاڵەتی سۆز، ئەو زمانەی پێش ئەوەی بگەرێ هەموو پەشموردەکانی تەمەنی لێدەرژێ و بەهاکانی مرۆ دەکاتە هیچ، چونکە وەختێک زمان دەگاتە هەوای خۆی هەموو بەهایەکانی دیکە لە جوانترین شێوەدا لە ناویدا دەتوێنەوە.

ناکرێ لە راستی لافاوی سۆزو هێرشی رووباری حوزنی بێ دەسەڵاتانەی «حەسەنی دەلاک» گۆشەگیربین و حەزنەکەین خۆمان بە دوکانە ساردەکەی داکەین و وەهمەکانی زیندوو کەینەوە.

وەهمەکانی حەسەن ئەوەندە زاڵن بە باڵای وشەکاندا دەفڕن و چواربەندی رۆمانەکە جێدێڵن و خوێنەریش گەمارۆ دەدەن.

«حەسەن چاوەکانی پڕ فرمێسک و سیمای سوورهەڵگەڕاو

توڕەبوون... وڕەی پانکەکەش لەگەڵ دەنگی یەکە یەکەی پێی ڕێبوارانی سەر شۆستەی کۆڵانەکەدا تێکەڵ دەبوون و دەنگەکان وێکرا ئاوەدانیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا...» ل١١٣

حەسەن لەوە دەگا تەمەن تێپەڕیوەو خەونەکانیشی لەگەڵ خۆی بردووە «تەنها ئەم چاوچێوەیەی دەستم وێنەیەکی تاقانەو لە دڵا شیرینی بینیوە ئەویش وێنەی بە هەیبەتی ئەزیەنی بوو» ئاوێنە سەرابییەکان/ ل١١١

* تاقانە بە هەموو واتاکانییەوە ئەو واتایانەی نووسەر بەرایەڵی نادیار بە وێنەکەی بەستۆتەوە.

* دارمانی بورجەکان «٢» کە دەکرێ بە بورجی «٢»ش بیخوێنینەوە، چونکە ئەو هەرەسانە تەواکەری یەکترین یان یەک هەرەسن و بە هەموویان هەیکەل و وێنەو ڕەمزەکان لە مێشکی گەلێکدا دروست دەکەن و دواتریش تێکی دەشکێنن و هەموو خانەکانی لێکهەڵدەوەشێننەوە.

«ناوی هەرسێکیان لەسەر کردایەتیەوە بەڕاپۆرتێک دراوە بەمان.» ل١٦٦

نووسەر تا سەر ئێسقان بەدوای حەقیقەتە ماددیەکاندا دەگەڕێ کە شکلیان لەبەر پانتایی نەفسی کەسەکان پێشانداو هەیکەلی ڕۆمانەکە کاملکا.

* زاڵ بوونی خوێن.

سەرەڕای نەزیفی بێوچانی ڕۆمان «وەک مێژوو»، ڕۆمان وەک نەخشەکانی جەستە، هەموو دیمەن و یادەوەری و خەیاڵەکانی دیکەش بۆ تۆخکردنەوەی «خوێن» خراونەتە گەڕ.

* سەروو کەللەی خوێناوی عەرەبانچیەکە. ل١٥١

* فەرماندە ددانەکانی لەسەر یەک جووتکردن و... لەگەڵ هاوارێکی قایمدا ددانی مشارەکەی لەسەر ئەنیشکی دەستە ڕاستی جەعفەر داناو دەستێکی قرتاو کەوتە ژێر مێزەکە. ل١٥٤

* کەمال بەردەوام تفە خوێناویەکانی دەمی دەپرژاندەو سەر ئەردەکەی بەردەمی. ل٨٩
* دوای منداڵەکان سەگەکان هەڵدەواسن «دارمانی بورجەکان «١» لەبەر ئەوەی بەخوێن دەورە دراون «یەکەمجار عوسمان چەقۆکەی وەشاندو لەناو سکی یەکێک لەسەگەکاندا چەقاندی، قالەش بە هەموو هێزی چەقۆکەی لە مشت ناو کەوتە لێدان سەر و سک و سنگی سەگەکە»
زۆر لەوە شەرم دەکەم کە بڵێم ئێمەی کورد لە یەکێک لە بازنەکان مێژوودا دەوری ئەو سەگانەمان هەبووە.
* دواتر سەربڕینی بەرانەکە، هەستانەوەی بەنیوە سەربڕاوی و رەنگ کردنی ماڵ «ولات» بەو خوێنە سوورە.
بواری ئەوە نیە هەموو ئەو دەلالەتانە بخوێنینەوە، بەڵام دەکرێ بەسادەیی بڵێین «خوێنی یان رەنگی سوور بەهیچ شێوەیەک جێگا تەئەمولی تێدا نیەو رەنگی هەڵوێست و بەرەنگارییە».
* ئەو پرنسیپ و بنەما سەرەکیانەی بیری نەتەوەیی لێک گرێ داوەو گەشەی پێدەکا لەسەردەمی «کەریم و سەمەد و جەعفەرو قالەو سیروان...» تێکدەشکێن و بوونیان نامێنێ، ئەو کەسانەی سەرەوە هەر ئەو کەسانە رەمزی سیاسەت و فیداکاری و گومڕاییەکانی دوژمنن، زۆر لە سەگەکان دڕندانەترو لەبەرانەکە وەحشیانەتر لەنێو دەبرێن ئەو نەوەیە «کە رەمزەکانی بوون لە زەینیاندا شەقیان بردووە، بوونە قوربانی پۆخڵەواتەکانی سیاسەتی نەوەی پێشتر، نەوەی برینە بۆگەنەکان و مامەڵە ساختەکان و نەوەی جەعفەر سەرسەختانەو تارادەیەک گەمژانە لەنێو جوغزەکانی نەوەی پێشتر هەڵدەسوڕێن و بێ سەمەر دەیانەوێ دیوارو وەهمەکان بشکێنن، ئەو هەوڵانەش جگە لەرەنگین کردنی سیمای ژەنگاوی نەخشەکانی پێشوو چیتر نیە.
ئەو نەوە بەستەزمانە بووە میراتگری کانیە بۆگەنەکان و وەهمە هیچەکانی سیاسەت، ئەوەتا «ئەو نەوەیەی پێشوو» ژیانمان و زمان و

ئەندێشەو نووسینمانی داگیرکردووە.

* دەتوانین بۆ دارمانی بورجەکان «٢» بڵێین

دەرگایەک بۆ رەتکردنەوەی قەدەری مێژوو، دەرگایەک بۆ خیانەت و دەرسێک بۆ نوشست و هەوڵێک بۆ دارمان و فورسەتێک بۆ خەجاڵەت بوون.

* ئێمە رامانی جەعفەر دەبینین لەنێو گوڵەباخە زەردەکانداو خەجاڵەتیەکەش دەبینین لە کوژرانی مامۆستا سەرداردا.

- ئافەرم جەعفەر بۆنی ئەو گوڵەباخە زەردە بکە بزانە بۆنی چەند خۆشە.

«دواتر»

جەعفەر لەژێر جەستە گەرم و خوێناویەکەی مامۆستا سەرداردا سنگی هەدەفی بوو.. ل١٨٣

* دارمانی بورجەکان «٣» پێگەیشتنی حاڵەتی نەفسی کەسە بێ هێزو شکستەکانی ناخی هەریەک لە «مروەت و خاچیان»ە، ئەو تێگەیشتنە کوشتنی نەزانینەو ئاشکرابوونی کونجە تاریکەکانی کارەساتە، یان گەیاندنی رووداوە بە دنیای زانین و بەتاڵ بوونی مانا...

- ئەوەی بەسەر منیان هێنا دنیا دنیایە بەسەر جوولەکەیەکی وەک تۆ نەهاتووە. ل١٩٦

بێ ئەوەی خاچیان گوێی لەو قسەیە بێ یان لەو ژوورە بێ، تێدەگات و خانەکانی نەزانین دەبڕێت و لەبەر خۆیەوە دەڵێت.

- «دەزانم ئەو باوک سەگانە چیان بەسەر هێناویت.» ل١٩٨ جگە لەوان دوان، ئەو مەخلوقە کەم نەفامەی لە گەڵیانە «مینا» لەو زانینە بێ بەش نیەو پێش ئەوان دەڵێت.

- «دایکم دەبەن بەشوو».

ئەوەش دواپلەی تراژیدیایە کە بتوانێ لەو بابەتانەدا رۆمانووس

پێیبگات.

***

ئەو رۆمانە کە دەکرێ جوانترو وردتر لە زۆر لایەنەوە بخوێندرێتەوەو تەلیسمەکانی بپشکێنرێ، بەڵام چونکە ئەوە دوا «طموح»ی ئێمە نیەو دوای دۆزینەوەی هەر نەزانراوێک پرکێشی نەزانراوێکی دیکە دەکەین، هەست دەکەم ئێمە وەک تێر بووین لە رووداو» بەسەرهات دەگێڕینەوە، نازانم چ سەمەرێک لەوە دامـاوە «تاکی کوردی» تا دواپلە رەزیل بکرێ و ئەشکەنجە بدرێ و هەڵواسرێ هەموو دەرگاکانی لەزەت و خەون و فەنتازیای بەڕوودا دابخرێ داخۆ شەرەفی ئەوەی پێدەبڕێ «پاڵەوانی زیندان بێ و ئافەرینی گەورەکان وەرگرێ.»

دیسانەوە دەڵێم کاتێک رووداوێکی تەواو بوو، یان زانراو دەگێڕینەوە، کاتێک سوورین لەسەر گێڕانەوەی مێژوو بەدێو جامەکانیەوە، سوورین لەسەر گێڕانەوەی ئەو رووداوانەی کە سەردەمێکە زانراون و سیحرێک تێیاندا جێی نابێتەوە، لەو حاڵەتانەدا خانەکانی تێگەیشتنی و پێگەیشتن زمان یەکەمجار سنووردارو دواجار تێکدەشکێن.

# خۆری تار

«خۆری تار» تاکە رۆمانی، تازە چاپکراوی مامۆستا رەوف حەسەنی چیرۆکنووسە، وەک بەشێک لەو هەولانەی کورد دەستی داوەتێ، بەو نیازەی بتوانێ لەدوا هەناسەکانی سەدەدا شوێن پێیەک هەرچەند کاڵ و لەرزۆکیش بێت بۆ رۆمان رۆنێ.

هەر لەم سەدەیەدا مرۆ «لە مێژووی نوێدا» بۆ یەکەمجار و بە ئاشکرا تامی داری مەعریفەی کرد و لەوەش حاڵی بوو کە تەنیا لە رێگای ئەو دارەوە دەگاتەوە بەهەشت. ئێمە ناچارین وەک کورد، وەختێک تەماشای خەرمانی ئەدەبی بەتایبەت «خەرمانی رۆمانی» ئەو سەدەیە دەکەین، وەک دەنکە نۆکێک بڕوانینە کێوی دنیا، لەوکاتانە ناچارین ئەو بەرهەمە قەشەنگ و ناوازانەی دنیا بەبەرهەمی بیرو هەوڵی «ئینسان» بزانین و وەک هاوبەشێک لەو خەرمانە گەورەیە بڕوانین بەو حساوەی کە ئێمە هەر لەو سەدەیەدا ژیاوین با لە پەراوێزیش بین، ئەوەش دەمانخاتە دووخانەو دوو هەلوێستی لێک جیا.

١) وەک بوونی نەتەوەیی و مرۆییمان خاوەنی ئەو شەرەفەیان چ نەبێ هاودەم و هاوبیر و هاوکاتی ئەو فەیلەسووف و داهێنەرو رۆشنبیرانە بووین رەورەوەی مێژوویان بەشکۆمەندی بەرەو سەدەی نوێ گواستەوە.

٢) لە هەمان کاتدا ئەرکێکی گەورەمان لەسەرشانە کە دەبێ لە

کارەکانماندا ئەوە لەبەر چاوبگرین کە ئێمە دایەلۆگی دنیایەک دەکەین مێژوو کلتوورێکی دەوڵەمەند و فراوانی هەیە و تەنیا لە ژووره تاریکەکەی خۆمان نادوێین.
ئەوە تەنیا رایەکی گشتی بوو، بۆ ماڵئاوایی ئەم سەدەیە.

*　　*

مامۆستای نووسەر هەر لە پێشەکییە پڕ ختوکەکەیدا زیاد لە جارێک پێمان دەڵێت کە لە کاتی خۆ دزینەوە لە کورتە چیرۆکی نەشمیل و ناسک پڕژاوەتە سەر رۆمانی گەورە ژنی خان و مان.
- نا.. خۆم چاک دەزانم ئەو کیژە کراس کورت و شان و قۆڵ و گەردن رووت و مەرمەڕەی ناوی کورتە چیرۆکە.... پەیمان شکێنی فێرنەبووە. ل٨
- نا خۆشەویستەکانم نا.. هەرگیز دەست لەبەژنی باریکی کیژی سرک و جرپن و خنجیلانەی خۆم بۆ خاتوو رۆمانی قەیرەکچ بەرنادەم... ل ١٠
* ئەو زمان و سۆزو لاوانەوانەی چیرۆکی کورتی بەراستی عەشقێکی خاوێن و شۆڕبوونەوەیەکی پڕ وەفاو مەزنی تێدایە...
ئەو خۆ دزینەوە لە چیرۆک یان وەفا و عەشقە بەتەواوی بە رۆمانەکەوە دیارەو هەناسەی کورتە چیرۆک و زمان و تەکنیک و توانا و فەنتازیای چیرۆک داگیریان کردووە.
* خۆری تار، هەژدە بەشەو هەر بەشەی نێوێکی سەروەخۆی هەیە، نێوەکانیش زۆر بە ئاسانی هەڵبژێردراون.
* یەکەم پارکە نێوی «ئاوازی تەنیاییە»، دەتوانین بڵێین بە جوانترین رستەو بیری رۆمانەکە دەکرێتەوە.
-«وریابە!
کە پەڕەکان هەڵدەدەیتەوە وریابە با خشەیان لێوە نەیەت... نەبا حەمەی کوڕم دابچڵەکێت... نەبا بیرو لێکدانەوەو بیرەوەرییەکانی بپچڕێن... زۆر وریابە! قەزات لەمن کەوێت... حەمە زۆر ماندووە

لەوانەیە لەودیو ئەم پەڕەیەوە نووستبێت.» ل١٥.

ئەو وشە ناسکانە، فرمێسکی ناخی دایکن، ئەو دایکانەی نە وەک حەزرەتی ئیسماعیل جارێک، هەر لەسەرەتای مێژووەوە منداڵی خۆیان لەسەر شانەو دەیکەنە قوربانی.. بۆ ئەوەی کەس کاوڕێکیان لەجێ خەسار کا.

*        *

* **کەسەکان:** هەرچەندە ڕۆمان و پانتایی ئیشکردنی بەتایبەتی ئەو شێوە ڕۆمانەی کە دەشێ نێوی کلاسیکیان لێنابێ «لەگەڵ تەواوی ڕێزو نەوازشم بۆ وشەی بڵند و پڕ گەوهەری کلاسیک» داوای تاریف و کامڵ بوونی کەسیەتیمان لێدەکات لە بازنەکانی ڕووداودا، بەڵام نەخولقانی فەزای ڕۆمان و کەسیەتی ڕۆمان لە ناخی کۆمەڵ و ناخی نووسەر ئەو ئاڵقەیەی پەڕاندووەو بەشی هەرە زۆری ڕۆمانی کوردی ئەوانەی گوایە کلاسیکن هەر لەسەرەتاوە کەسیەتی کامڵ و پێگەیشتوون هەموو توانای فیکرو فەلسەفیی نووسەریان هەیە.

بێگومان لە خوری تاریشدا ڕووداو و پانتایی بیرکردنەوە هەر لەسەرەتاوە بەشی هەر کەسی لێدراوە بۆیە ئێمە وەک -خوێنەر- چاوەڕێی هیچ تەکان یان سەرسوڕمانێک ناکەین، یا ئەو سەرسوڕمان و بەرەوپێشچوونەش بۆ گەشەکردن و لەدواچوونی ڕووداویش بێت. یان دەتوانین بڵێین:

* فەتنازیا و خەیاڵ و سیحرو زمانی ڕۆمان هەر لەسەرەتاوە لە کامڵ بوون و تەقینەوەی ڕووداودا خنکاوە.

*مەلا سایەق، رایەڵی زیندوو کەسیەتی بەرەونەق و نهێنگری ڕۆمانەکەیە.

* فەرهاد: لە دواساتەکاندا هەنگاوێک بۆ بەرەوپێش چوونی کەسیەتی فەرهاد نراوە، ئەگەرچی ئەو هەنگاوە لەسەر شێرانی کەسیەتییەکەش بێ، دیسانەوە سەرکەوتووە، دەتوانین بڵێین لە کۆمەڵگای ئێمەدا حەقیقەتەکان لە شێتێکدا نەبێ دەرناکەون.

**کۆتایی:** من وەک خوێنەرێکی چووکەڵەی نووسەر، یەک دیوی زمان و سادەیی و وەستانی رووداو و ون بوونی فەنتازیاو خنکانی خەیاڵ و زاڵ بوونی زمانی گفتوگۆ و گوتار و ئاماژە بۆ ئەوە دەبەمەوە کە برای نووسەر سیخناغە لەو رووداوو کارەساتانەی تاسەر ئێسک هەموو کوردێکی بڕیوە، کە ئەوانە «کرداری تەواوبوون»، دڵسۆزی نووسەر بۆ مەسەلە نەتەوەییەکان «بێ ئەوەی خەتای نووسەر یان خوێندنەوەی ئێمەی تێدابێ» خنکانی قەڵەمی نووسەر لە رووداودا هەموو خانە و پەنجەرەو توانا گەورەکانی ئەمرۆی رۆمانی لێ ستاندۆتەوە. ئەو تواناییانەی کە نووسەر لە هەموومان زیاتر پێی دەوڵەمەندە.

# شەمشەمە کوێرەکانی گومەز

شەمشەمە کوێرەکانی گومەز، سەفەرێک بە دنیای خەون و گەڕانێک بە دنیای وشەو نوچدانێک لە دنیای خوێن و هەتێکێک لە ئەڤین و مێژوو، ئێمە مێژوومان لە خوێن نزیکترە تا- بەسەرهاتەکانی دیوەخان و پاشموردەکانی دنیا. تا خەون و سەفەرەکانی مرۆ.

بۆیە عەشق و شەو زەنگەکانمان هەمووی بۆنی خوێنیان لێ دێ، بۆنی خوێن بن زمان و بن پێست و منداڵیمانی قانگ داوە، ناکرێ لەسەر جێی ژن و باخچەی منداڵان خوێن لە بیر بکەین. هەر لە دێرەکانی سەرەتاوە «حوسێن سۆران» ئاڵایەک لەبەر دەممان هەڵدەکات و نیازێکی خۆیمان بەسەردا دەسەپێنێ.

(وا ئەمرۆ بەکارێکی دی بکرە چاتر لە وەهم و وڕێنەو خەیاڵ، شەڕی دنیاو فەزایەک لە رابوونی روحی سەرکێشانەی خۆم ئەکەم و تا راست و دروستی خۆم و قاندڕەکانم لاروون بێ)ل١٢.

هەر چەندە رابوونی روح شتێکە لەوەهم، بەڵام لەو سەرەتایەوە «شەڕی دنیا» دەبێتە دەرگایەک بۆ روون کردنەوەی «خود»، دەشێ لە هەندێ حاڵەتدا لەوە بێ ئاگابین کە شتێک نییە بەنێوی «روون» کردنەوە، روون کردنەوە بە تاڵ بوونەوەو بێ مانابوونە، چونکە فەزای نووسین گەرداو و کێشەیە، هەر چەندە دەکرێ وەک حاڵەتێکی

سایکۆلۆجی، دەربڕینی ئەو ئەندێشانە ئاسوودەیەکی گیانییان تێدا بێت.

*　*　*

نووسەر بە خانەکانی ئەندێشەدا دەچێتەخوارو مەیدانەکانی سۆز بەسەر دەکاتەوە، هەر چەندە لە هەندێ جێدا لاپەڕەکانی روون کردوونەتەوە ئەو مەودایەی لێ تەسک دەکەنەوە. ئەوەش لە سێ تەوەر، یان بنکە و بەیداخە دیارەکان.

١- کارکردنی دین وەک ترس و خورافە وەک دیوارو تەیمان لەسەر سایکۆلۆژییەتی گشتی:

(هەموو گەڕەکی لێدەکردم بە جنۆکە! دوای گوێبیستی چیرۆکەکانی رەعنە پێم وایە هەموو کتێبە پیرۆزەکانیش ئەفسانە و بەسەرهاتی سەر زەمینن نەک ئاسمان) ل١٣.

٢- کاری روخێنەرانەو داگیرکەرانی سیاسەت لەسەر فیکر و بونیادی بیرکردنەوەی تاکەکان.

(من دەمزانی دێ، چونکە هیچ زاتێک نییە... وەک ڤارگۆی سیاسەت درۆی زیرەکانە هونەری گەورەی هەبێ) ل٩٦.

٣- نووشستی نەتەوە، نووشستی بەها پیرۆزەکانی گەل،دابەزینی تێک گەیشتن بۆ خانەی سفر.

(ئیتر زانیم لەگەڵ ئەو پێ پەتیانە دەروازەیەک نەما پێچ و پەنای تێدا بکەم).

ئەو سێ خاڵە لە بیرکردنەوە هەر سادە و رۆژانەکان، لە کاری تاکە کەسی و تایبەتدا لە وشە هەرە چوکەڵەو منداڵانەکاندا رەنگی داوەتەوەو تامەکانی دیکەی ژیانی داپۆشیوە.

*　*　*

هەر چوار بەشی ئەو نووسینە، تەواوکەری یەکترن، هەر چەندە بەشەکانی سەربەخۆش دەخوێندرێنەوە، چونکە تەواوکەری ماناشن، ئاتەو مانایەکانی دیکەی خۆشەویستی ئەو رایەڵانەن تەونەکەیان

لەسەر چنراوە.

چەک هەڵگرتن ماناکانی خۆشەویستی فاتەبەتاڵ دەکاتەوە.

(پێویست ناکات هیچ بڵێی تۆ ئەو چەکە فڕێدە، منیش لەسەر دەستی پیاو ماقوڵانی ئاوایی... زەماوەندتان بۆ بگێڕم) ل٤٥.

خۆشەویستی فاتەش ماناکانی ژیان دەشواتەوە (من چەند جارێیم وتوی لە گومەزی ئەم دەڤەرە عەشق نای خوا) ل٧١

گێڕانەوە لە حاڵەتێکی پڕ سۆز و حەسرەت، پڕسکالآ و خوێن رووداوەکان بەسەردەکاتەوە، نەچۆتە نێو وردەکارییە چیرۆک کوژەکانی رووداوەوە، ئەو وردو درێژ بوونەوانەی رووداو زمان دەکوژن و چیرۆک سەقەت دەکەن.

*** زمان**

زمانی گشتی، زمانی بەرەنگاری و هەڵوێست و حەق بە خۆدانە، دەتوانین بڵێین زمانی سەردەمی رووداونی حەقیقی رووداوەکانە، زمانی سەردەمی رەش و سپیە، زمانی سەردەمی گۆللەو دڵە، زمانی سەردەمی خەنجەرو خوێنە، زمانی ئەو سەردەمەیە کوردی ئەنفال کراو، ئەوەندەی ئازادی هەبوو مردنی بە گوللەیان شمشێر هەڵبرێژێ.

ئەوە خەتای نووسەر نییە، کە جوانییەکان لەو شێوانەدا پێشێل دەکرێن، ئەوە خەتای نووسەر نییە خۆشەویستی دەدرێتە بەر چەقۆ، نووسەر تەنیا دەتوانێ ژانی چەقۆ بنووسێتەوە، ئێمە لەو خانەوە زمانەکەی لێ وەردەگرین، لەو خانەوە دەگەڵ زمانی دەدوێین.

ئەورۆ تەنیا دوو خانەمان نییە، مرۆڤەکان لە دوو دەرگاوە ناچنە نێو دنیا، جوانییەکان فرەن و زمان فرەتر.

(پێی چەوت قبوڵ ناکرێ، تۆ جوانی دەزانم هەموو کەسێ تەماشات دەکا، بواری بە هیچ کەسێ نەداوە باسی مافی ژنانی بۆ بکات) ل٤٤

(تا ئەو رۆژەش نەتدەزانی ئاو یان خوێن لێویان سوور کردووە... وشەی تازە، مەرگی تازە...)

(سەرتیپ لە حەزرەتی گوشتنی گەلە کچانی دوێنێ بەدەست

جرجەکانی گومەزەوە هاواری بۆ....)
نە سەرتیپ ونە هیچ کەسێ نەیاندەتوانی لە جوغزەکانی زمانی رەش و سپی دەرچن ئەوەتا
(دایکم لە رۆژی لە دایک بوونمەوە پێی وتم.. رۆڵە من نیشتمان لە چاوتا ئەبینم)
نیشتمانی ئێمە موفرەدێکی دیکەی خوێنە.
**کۆتایی:** خاڵی جوانی شەمشەمە کوێرەکانی گومەز ئەوەیە، نووسینەوەی سۆزو ئەندێشە و خەیاڵە مەستەکانی دوای رووداوە، وشە وەک راگوزارییەک بە کەنارەکانی رووداودا تێدەپەڕێ، ئەوەش هەناسەکانی وشەی فراوان و سەدای رووداوی جوانتر کردووە. ناکرێ ئەوەش نەڵێین کە ئێمە هەموومان لە خانەکانی سۆزو ئەندێشەدا نقووم بووین و پێویستە مەوداکانی دیکەی دنیاش ببینین.

# ئەسپیدیلۆن
# دنیای سەرپشتی ماسی

دنیای فراوان و پڕکێشەی چیرۆک ئەگەر لای ئێمە لە پێڕۆکەدا بێ، بالای ئێمە تازە وە سەرپێ کەوتبێ، بەڵام ئەو دنیایە هێندەی دنیای بێ بایەخ و هیچی هەناسەدان گرنگە. گرنگترین هۆش بۆ بەچوکەڵە ڕاگرتنی ئەو دنیایە ئەوەیە تا ئێستا پانتایی دەقی چیرۆک وەک کەرەسەی سەربەخۆ، وەک زمان و ئیستاتیکای وشە، سیحری گوتن و خانەکانی بەردەوامی ڕستە، لای ڕەخنەگر و نووسەران نەبوونەتە پرسیار، حاڵەتی پرسی زمان، ئالیەتی زمان وەک فەلسەفەی ژیان و بونیادی دەق نەخراوەتە ڕوو، بێ ئەوەی دەست بۆ ڕێڕەوەکانی ڕەخنەی کێ و کێ بەرین و وتەی دانسقەو نایابی فەیلەسووفەکانی ڕەخنە هەڵڕێژیت، دەکرێ لە دەرگای زمان و خانەکانی دەربڕین و تەکنیک پرسیارەکانی ناخی چیرۆک بلەقێنین و زمانەکان بکەینەوە.

دەبێ ئەوە بزانین چیرۆکی کوردی زمانی خۆی هەیە، بونیادی خۆی هەیە، حاڵی بوون و خوێندنەوە و پرسیاری خۆی هەیە، ئەو دەرگایانەش بە مێشکی کوردی نەبێ ناکرێنەوە ئێمە ئەگەر ڕەوشتێکی چیرۆکمان نەبێ لە حاڵەکانی- دنیا بەدەر. ئێمە ئەگەر حاڵەتی چیرۆکی تایبەتمان نەبێ کەواتە هونەرێکمان نییە بەونێوە.

سەرەتاکانی چیرۆکی کوردی شتیان لەسەر نووسراوە، ئەگەرچی بەشی زۆری ئەو شتانە دەچنە نێوخانەی تۆماری و فەرهەنگی و حاڵەتە حسیەکانی چیرۆکی کوردی نەخوێندراوەتەوە. ئەگەر پێشتر هەنگاوێک نرابێ، ئەوە چیرۆکی نەوەدەکان هیچیان لەسەر نە نووسراوەو پۆلبەندیش نەکراون. ئەو ساڵانە دەشێ ساڵەکانی کارەسات و تەقینەوەو ئازادی و بەزین و کوشتن و سەرکەوتن و فڕین بێ. دەشێ زەمەنی سەد دیوبێ.

* ئەسپیدیلۆن کۆمەڵە چیرۆکێکی کاک کاروان عومەر کاکە سوورەو لە وڵاتی سوێد ساڵی ١٩٩٨ چاپکراوە، ئێمە لێرەدا وەک نموونەیەک لە چیرۆکی نەوەتەکان دەیخوێنینەوەو دەیخەینە بن پرسیاران.

## چیرۆکەکان

* ماسی ١٩٩٢ لاپەڕە (٥-١٣).
* جیهان لە فنجانی قاوەدا ١٩٩٣ (١٤- ٣٤).
* ئەستێرە ١٩٩٣ (٣٥- ٥٢).
* خێو ١٩٩٤ (٥٤- ٨٥).
* خوێنی کونەبەبۆ ١٩٩٥ (٨٥- ١٠٣)
* ئەسپیدیلۆن ١٩٩٦ (١٠٤- ١٦٢).
* پێڵاوی چەرخەدار ١٩٩٦ (١٦٣- ١٨٥).
* دەرگای چواردەری ١٩٩٧ (١٨٦- ٢٢٠).

هەر هەشت چیرۆک لە هەندەران و لە نەوەتەکان نووسراون.
ئەوەش زەمەن و شوێنی خۆسەپێن دەخوڵقێنێ.

* خەون و واقیع هێندە تێکەڵن مووەکی باریکیش نەماوە لێکیان جوێ کاتەوە، ئەوەش خەتای نووسەری تێدا نییە، مرۆڤ بۆ خۆی مەیدانێکی تێکەڵی ئەو دوو دنیایەیە، یان ئەو دوو دنیایە تەنها لە حاڵەتی ژیاریدا لێک جوێن دەنا لە موعانات و نەستی مرۆدا یەکشتن. ئەو دوو دنیایەش لە جوانترین حاڵەتیاندا خراونە سەرپێ. هەرچەندە

ئەو جۆرە بەکاربردنە تاقانە نیەو نموونەی زۆرە، دەشێ مامۆستایان حوسێن عارف و محرەم محەمەد ئەمین و مەم لە پایزە خەوندا و شێرزاد حەسەن لە بەشی زۆری چیرۆکەکانیدا نموونەی زیندووی ئەو حاڵەتە بن، بەڵام ئەوە دوا مەنزڵی چیرۆک نیە، رەنگەکانی چیرۆک تا ئێستا بە تەواوی نەدرەوشاونەتەوە بەو قەناعەتەوە ئەم قسەیە دەکەین کە دەبێ چیرۆک- ئەورۆ- دەرگا پڕ وەهم وسەد رەنگ و پڕ نهێنییانەی ئەفسانە راوەشێنێ و ستوونەکانی خلود هەڵنێ و بەراڕەوەکانی مردندا تێپەڕێ.

لێرەدا هەوڵدەدەین ئەو چیرۆکانە بەزمانی خۆیان بدوێنین، ئەگەرچی پێشتر هیچی ئەو چیرۆکنووسە بەتوانایەمان نەخوێندۆتەوە بەڵام ئەو هەشت چیرۆکە دەرگایەکی فراوانن بۆ چوونە ناو جیهانی نووسەر. سەرەڕای ئەوەش ئێمە لەو باوەڕەداین کە هەر چیرۆکە و بۆ خۆی وڵاتێکە و دەفتەرێکە چ پێویستی بە پێناسە نییە. ئەوەش ئەو رێگایەمان لێناگرێ کە چەند سەرنجێکی گشتی لەسەر هەموویان بنووسین.

١- زمانی یەک رەنگ

زمان لەوکۆ- چیرۆکەدا ئەگەرچی پاراو وبێگرێ و دەوڵەمەندە، زمان لەو چیرۆکانەدا ئەگەرچی خانەکانی پێگەیشتنی واتای تێدا فراوان و باڵایە، بەڵام ناکرێ ئەوە بشارینەوە کە دیسانەوە هەرهەمان ئەداتی ئامرازی دەربڕینە، زمان هەمان ئەسپی زین کراوە، ئەو بەکاربردنەی زمانیش هەرچەند نەک لە چیرۆکی کوردیدا، لە چیرۆکی جیهانیش شێوەی هەرە باوی وەگەڕ خستنی زمانە، کە ئێمە ناوی لێدەنێین، زمانی یەک رەنگ، یان زمانی یەک جۆر.

٢- بەتاڵکردنی زمان لە خانەکانی بەسەرهاتدا:-

دەشێ ئەو خاڵەش بەتەواوکەری خاڵی یەکەم دابنرێ، رووداو.. رووداو وەک کەرەسەی سەرەکی، رووداو وەک مردن و ژیان، رووداو وەک گوزارەو خەبەر، رووداو وەک گێرانەوەی مێژوو (رووداو بە خەیاڵ و واقیعیەوە) تاکە کەرەسەی دەربڕینی رووداو زمانە. بێ ئەوەی

بەئێزگەکانی پشوودا تێپەڕێ، بێ ئەوەی زمان لەودیو ڕووداو مانایەکی هەبێ ئەوەش ناو دەنێین، بەتاڵکردنەوەی زمان لە ڕووداودا.

* وا بۆ دووساڵ دەچێت «حەمە عەی» باوکمە، تا ئێستا جارێ لێم تووڕە نەبووە.. چاوێکی لێسوور نەکردوومەتەوە.... زللەیەکی لێنەداوم (ئەسپیدیلۆن ل١٢٤).

* جلوبەرگی باوکی لەبەردەکرد و دەهاتە دەرەوە... خەڵکی گەڕەک پێی پێدەکەنین و قاقایان لێدەدا. (جیهان لە فنجانی قاوەدا ل٢٧).

ڕووداو هەناسەکانی زمان تەنگ دەکات و شتێکیان پێناهێڵێ بۆ دەرەوشانەوە، دەشێ ئەو تەنگە نەفەسییەی زمان ناوبنێین «زەلیل کردنی زمان لە خانەکانی بەسەرهات»دا.

٣- نەفەس و هێڵی گشتی و خوێندنەوەی دنیای ڕووداوەکان لەهەر هەشت چیرۆکدا- یەکە- ئەگەر کەمێک پێدابگرین دەتوانین بڵێین بە لەبەرچاو نەگرتنی نێو نیشانی چیرۆکەکان- هەست بە تەواوبوونی چیرۆکێک و دەستپێکردنی یەکێکی دیکە ناکەی.

* خۆشم دەوێیت بەڵام. لێت تێناگم. (پێڵاوی چەرخەدار ل ١٧٣).
* من تائێستا لەتۆ نەگەیشتووم، کەچی هەر خۆشم دەوێیت.
(دەرگای چواردەری ل٢٠٣).

٤- چوارچێوە:

نە زمان نەچیرۆک پێویستیان بە چوارچێوەیان بیانوو نییە بۆ نووسینەوەیان، لێرەدا مەبەستمان لە چوارچێوە ئەو چەند دێرەیە کە چیرۆکنووس دەیکاتە سەرەتای چیرۆکەکەی دوای ئەوە خەیاڵ و فەنتازیا جڵەو دەگرنە دەست و حوکم دەکەن، بۆیە نووسەر بەکارامەیی خۆی لە کۆتایدا بە چەند ڕستەیەک ڕووداوەکە دادەخات یان چوارچێوەکە تەواو دەکات، هەر خەیاڵ و فەنتازیایەک هەر سیحرو زمانێک بگری ئەو چوارچێوەی ناوێت و دەسەڵاتە زەینییەکان لەوانە بەهێزترن.

- جیهان.. چیتە ئەمڕۆ!! دەخێرا کە قاوەکەت بخۆرەوە..

- نەخێر ناچم... ئیتر نەقاوە دەخۆمەوە و نەدەشچم بۆ قوتابخانە.
«جیهان لە فنجانی قاوەدا» ل٣٤.
- کەست نەدۆزییەوە حەمە عەلی چلّکن نەبێت..! دایکم پێدەکەنێت و منیش هێشتا خەیاڵ بەری نەداوم.
داخستنی چیرۆکی «ئەسپیدیلۆن ل١٦٢».
٥- خەیاڵی چیرۆکنووس هێندە فرەوانە، دنیای فەنتازیای هێندە بەرینە، کە بە پێچەوانەی زۆربەی چیرۆکنووسان لە هەموو چیرۆکەکاندا جگە لە- ماسی- ئەو خەیاڵ و فەنتازیا خۆرسکە بۆتە جیهانی پڕ سیحری سەربەخۆو تەکنیک و رووداوی سەرەکی تەسککردۆتەوەو پەیکەری گشتی چیرۆکەکەی داپۆشیووە. ئەو خەیاڵ و فەنتازیایەی کۆڵەکەی پشتی رۆمانن.
٦- لە هەر هەموو چیرۆکەکاندا تواندراوە تەمەن و ئەشکی بە باچووی منداڵی و رۆژانی بەسەرچوو، هەناسە و غەمە هەرە وردەکان، زمان و ئەتمۆسفیر و هەولێر تادوا پلەی جوان بەکاربراون ولە لەبارترین حاڵەت وەگەڕ خراون. ئەوەش جگە لە هەیکەلی کەسایەتی، هەیکەلی زمانیش تەواو دەکات.
* پڕ بەدڵ حەزی دەکرد ئەوانیش بە نەمری بمێننەوەو تاماوە وەکو سەردەمی منداڵی یارییان لەگەڵدا بکات... حەزی دەکرد ئەو یارییانەیان لەگەڵدا بکات، کە تا منداڵ بوو باوکی قەدەغەی کردبوون، (جیهان لە فنجانی قاوەدا. ل٣٣).
* خوام لەو خوایەیە بەیانی ئاوا بەم پیس و پۆخڵییە دبیتەوە، دەبێت بەقژ لە دەسکی ئەم پەنجەرەیەت ببەستمەوە.
* .....
* جووجەڵەی ناو خۆڵ، ئەوە هێشتا نەنووستوویت.
یادەوەرییەکانی منداڵی لە «پێڵاوی چەرخەدار»دا.
خەونەکانی منداڵی گەورەترین پانتایی هەرهەموو چیرۆکەکانی داگیرکردووە، ئەوەش دەبێتە هۆی دیتنەوەی ئەو رایەڵانەی خانەکانی

دەروون والآدەکەن و زەمەن نایشارێتەوە.

٧- سلێمانی وەک شار وەک زمان و وەک بیرکردنەوەو دەربڕین لەدوای رستەو وشەو ناوی کەسەکان خۆی ماتداوە. هەرچەند غەریبی نووسەرو نۆستالژای نووسەر لە قەلاو تەیراوەو تەعجیل و هەر هەموو هەولێردا دەخنکێ، خنکانێک کە دەبێتە هەناسە، ئەوە رێی لە نووسەر نەگرتووە کە هەر هەموو ئەوانە لە وشەو زمان و گوتنی رۆژانەی سلێمانیدا دەربڕێ، زاڵی نووسەر لەو بوارە منداڵی زیندووترو وشەی جوانتر کردووە.

ئەو وردە تێبینیانە شتی وردو سادەن، دەربارەی ئەو کۆچیرۆکەو چیرۆک بەگشتی، لێرەدا هەوڵدەدەین چەند چیرۆکێک بە جیا وەخوێنین.

## ماسی:

چیرۆکێکی کورت و پوختە، ئامراز و رەگەزی سەرەکی ئەو چیرۆکە «نامەیەکە» ئەو نامەیە هەست و بیرکردنەوەی داگیر دەکات، یان هەست و بیرکردنەوەی نامەکە داگیر دەکەن. لە بارێکی گشتیدا ئەو نامەیە تێکەڵکردن یان وەبیرهێنانەوەی چیرۆکێکی بەنێوبانگیی چیخۆفە ئەوەش بەشێوەیەکی هەرەمەکی نییە و بە مەبەستی جوانکاری و فراوانکردنی دەربڕین کراوە لێکچوونەکەش لە چەند خاڵێکدا کۆدەکەینەوە.

١- پەشێوی یان خانە بەگیرکردنی پاڵەوان لە تەنگانەدا.

٢- گەڕان بۆ پشت و پەنا (لای چیکۆف باپیری و ئەوەی خۆشمان دایکی).

٣- نامە لە هەردووکیاندا کەرەسەی سەرەکییە.

٤- خەون (وەک فەنتازیا، وەک وەسفی رابردوو، وەک تەواوکەری چیرۆک).

٥- مەبەست نییە نامەکە دەگا یان نا، گرنگ نامەکە بگاتە کەسی

ناخی خوێنەر.
ئەو کەسەی نووسەر لە خەوی هەستاندووە، ئەو کەسەی لە نووسەری نامەکە غەریبترە.
چیرۆکی ماسی لە دوو دەرگاوە دێتە نێو وڵاتی خوێنەر، یەکەمیان لەشیکردنەوەی حاڵەتەکانی نۆستالژیا و غوربەت، غوربەت بۆ نیشتمان و ماڵ و غوربەت بۆ شوێنی بەجێماوی نێو زەمەنی دەم با، ئەو شوێنەی لە زەمانێکدا وجودی هەیە کە تێپەڕیوە، تاکە لەزەتیش سوتانە لەنێو ئەو بێهودەییە.
دەرگای دووەم هەر غوربەتە، نامۆیی و گومان لەوجود، گومانە لە هەناسەو خوێن، بەڵام ئەو غوربەتە، غەریبی کەسیەتی کوردە، نامۆیی کورد وەک زمان و وڵات و کەسیەتی. ئەو غوربەتە بەڕادەیەک کەمەر شکێنە، بەڕادەیەک پڕ مردنە، بەڕادەیەک بێ ئومێدو هیچە کە بۆت نییە ناونیشانی کاولەکەت لەسەر زەرفی نامەو لەسەر زەرفی فرمێسکەکانت بنووسی. ئەوەش دواپلەی نامۆیی و دواپلەی وەدەرنانە لە مێژوو.
* هەرگیز خۆی وا بەکلۆلی نەدیوە، نامەکەی دەستیشی لەخۆی کلۆلتر... دەینوسێنێت بە سینگیەوە، سووک لە دڵی نزیکی دەکاتەوە... بیرناکاتەوە «ئاخۆ ئەمە دڵی دەرهێنراوی خۆیەتی، یان هی دایکی..؟!» «ماسی لاپەڕە ١٢»
ئەو سۆزو خۆشەویستیە، ئەو غوربەت و پەژموردەییە، بەرانبەر دنیایەک کەتۆ وەک زەمەن و وەک نیشتمان شوێنێکت تێیدا نیە، هیچە، زەمەنێک، مێژوویەک هەرچەندە گەورە بێت «تۆ» ناخوێنێتەوە کە هیچت لەسەر نەنوسیووە. لەو ماڵە گەورەیەی دنیا هەتا لەزەمەنی «عەولەمەشدا» مادام ژورێکت نییە، نامەکەت «کە دڵی دایکیشت بێت» ناگاتە هیچ جێگایەک.
«ئێستا تا ساتێکی دی بۆ ناردنی نامەیەک دەبێت بەگاڵتەجاڕی ئەو خەڵکە» «ماسی لاپەڕە ١٩»

* گاڵتەجاڕی «دیۆجامەی ئەنفالە لەسەردەمی عەولەمەدا».
کۆتایی: چیرۆکەکە لە تەکنیکێکی جوان و وێنەیەکی جوانتر دەگاتە پایان. ماسی بەستووی نێو شووشەکەو «ئەوی» بەستووی نێو تەنهایی و غوربەت کامیان هومێدیان زیاترە ماسی بەستووی نێو شووشەکەیان «کوردی» نێو دنیا؟ ئێستا ئەمیش نەک، هەر دەستی، هەموو گیانی تەزیووەو وا هەست دەکا ماسییە وردەکەیەو بۆتە شەختە. (ماسی لاپەڕە ١٣)
ماسی بەستووی نێو شووشەکە «ئەوی» بەستووی نێو دنیای غوربەت
ژیانی بەستووی نێو زەمەنی منداڵی، کوردی وەدەرنراو لە مێژوو

## * ئەستێرە (٣٥- ٥٢)

چیرۆکی ئەستێرە بەو رستە دەستپێدەکات «ئەوە خۆ قسەکانی سازگاربوون بەڕاست!» ل٣٥
بەکاربردنی «بوون بەڕاست» بە مەبەستی گواستنەوەی حاڵەتی سەرسامیَ لە کەسی یەکەمی چیرۆکەکەوە بۆ خوێنەر، ئەوەش تێکەڵکردنی منی خوێنەرە یان داگیرکردنی هەستەکان و بەستنەوەی ریتمەکانی هەناسەیە پێکەوە. دەپرسین «باشە ئەو قسانە چین بوون بە ڕاست؟» ڕاستە چەند قسەو هەواڵ لە ئارادان، بەڵام نووسەر تەنها مەبەستی جڵەوکردنی هەستەکانی خوێنەرە بۆ مەیدانێکی سەرەکی و سەختر، ئەویش راڤەکردنی حاڵەتەکانی کەسی یەکەمی چیرۆکەکەیە.
کەرەسەی سەرەکی بۆ ئەو راڤەکردنە تەنها رووداوە، ئەو رووداوانەی کە دەشێ لە شوێنی خۆیاندا چیرۆکی سەربەخۆ بن. با بە چەند ئاڵقەیەکی دیارو نادیار رووداوی سەرەکی تەواوکەن... هەرچەندە ئەگەر زمان دەسەڵاتی تەواوی خۆی بدرێتێ رووداوی سەرەکی ولاوەکی لە گۆڕێدانییە.
* بۆ زیاتر چوونە نێو دنیای چیرۆکەکە دەبێ ئەو ئاڵقانە لێک جیا بکەینەوە کە پانتایی چیرۆکەکەیان پێکهێناوە.

**ئاڵقەی یەکەم:**

«وەهمەکانی تارا»:

تارا لە وەسفێکی زۆر گشتیدا تەنها ناوی کچی دراوەتێ، دەشێ هەر کچێک بێت، کەسی یەکەم دەخاتە حاڵەتەکانی دوان و پەیامەکانی خۆشەویستی «تارا»- کەمترین- پانتایی لە رووبەری گشتی چیرۆکەکە داگیرکردووە ئەگەرچی وەک کەرەسەو بابەتی سەرەکی مامەڵەی لەگەڵدا کراوە.

«تەنها بیست دەقەت بەدەستەوە ماوە، جارێکی تریش دەفتەرەکەی بەردەمت پەڕەپەڕە دەکەیت.. چۆنت وەرگرتوو هەروایە، ئەوە نەبێت لەسەر لاپەڕەی یەکەمی چوارپیتی «ت...ا... ر...ا»ت بە گەورەیی و جیا لە یەکتری نووسیوە» ئەستێرە لاپەڕە ١٠٥٣

**ئاڵقەی دووەم:**

خۆزگە شێن نەبووەکانی وریایە کە زیاتر حاڵەت و توانای دەروونی و زایندەی کەسی یەکەمان بۆ دەردەخات.

* دوایی ماچو مووچ و دەستبازی شتی تریش دێت. ئالێرەدا پۆخڵەواتەکانم دەردەکەون. (ئەستێرە- ل٤٠).

ئەگەر بە دەلالەتی وشەدا رۆبچین دەبێ بۆ نزیکی (شتی تریش) و «پۆخڵەواتەکانم» بگەڕێین. ئەو شتانە چین کە ئەوتێیاندا دەستەوشانە؟

**ئاڵقەی سێیەم:**

شتە نادیارەکانی منداڵین، ئەستێرە وردەکانی تەمەنی بەسەرچوون، ئەو رۆژانەی دەیەویست ئەستێرە بگرێت.

* تۆ هەر ئەوکاتە بیرت لەوە دەکردەوە ئەگەر هەر ئەو کرێکارانە پەیژەیەکی درێژ.. درێژ بێنن، ناتوانن پیایدا سەرکەون و ئەو ئەستێرانە داگرن..؟!

... حەزت دەکرد کۆمەڵێ ئەستێرەی پرشنگدارت هەبێ.

(ئەستێرە ل٤١).

تادەگاتە ئەوەی پەردە لەسەر گەرمترین چیرۆک و کەشفکردنی دەستە پاچەیی خۆی بەرانبەر کچان لادەدات.

**ئالقەی چوارەم:**

«ئەحلام وەک جنس و بەس» :-

خوێندنەوەی ئەو ئالقەیە وەک بابەت و کەرەسەیەکی سەربەخۆ، وەک بنیات و بناغەی گێڕانەوە، خوێندنەوەی خانەکانی هەوەس و، شەهوەت، وەک ڕێگایەک بۆ دیوی مێ.

«پێڵاوەجکان دوو ئەستێرەی سپی وەکو زیویان بەسەرەوە بوو، قاچەکانی هەر دەتوت پەیکەرتاشێکی زۆر کارامە لە بەفر دایتاشیوون.. نەترسایت نە هاربێت و لەبەرتینی گەرما بتوێتەوە» ئەستێرە لاپەڕە ٤٨ .

«ئەحلام» دەشێ هەر تەنها خەونێکیش بێت. ئەحلام ئەو کچە عەرەبە پڕ جنسەی، دەرگای لەزەتەکانی خۆی بۆ دەخاتە سەر پشت.

تینووی شەو و پیاوە.

«شووم کردووە، بەڵام مێردەکەم بە کەمی لە ماڵە..» ل ٤٣ .

هەر لە ناو ئەو ئالقەیە، ئالقەیەکی دیکە بەڵام تۆخترو کاریگەرتر هەیە، هەر لەو ئالقەیەشدا دەگەینە خانەکانی کۆتایی ڕووداو.

**ئالقەی پێنجەم:**

تەرمی پەری و زلێخا یان خەسین.

لێرەدا چیرۆکنووس توانیویەتی «بەسەرهاتێکی» ڕۆژانە بکاتە کرۆکی چیرۆکەکەی و حاڵەتێکی توندی دەروونی و شێوەیەک لە ئەفسانە دروستکا. تۆ لە ڕوتوشی ئەو هەموو بەسەرهاتانە گەرێ، تەنها ئەو چیرۆکە و ئەو ئەنجامانەی لێیدەکەوێتەوە ئەگەر بابەت و کەرەسەی سەرەکی بان و کاری زیاتریان تێدا کرابا، هەرچەندە ئێستاش هیچی لە چیرۆکێکی سەربەخۆ کەمتر نیە.

ئەو ئالقەیە بەسەریەکەوە خانەکان یان بەرگەکانی چیرۆک تەواو دەکەن و لایەنەکانی درامی پێکدەهێنن.

**کۆتایی:**

وەک رووداویان وەک کـۆتایی حـاڵەتی دەروونی کـەسی یەکـەم، لە هەردوو باردا یەک کـۆتاییـە، وەک وەزیفەیەکی درامی، یان تەکنیکی رووداوی شەوی گـۆڕستانەکەو زراوچوون و شڵەژان و کـاریگەری لەسەر حاڵەتی فسیۆلۆجی کۆتایی دروستی چیرۆکەکەیە، ئەو کۆتاییەش هەر لەسەرەتاکانی چیرۆکەکە لە ڕاڕایی و ترسانی لە «مێ» بە دیاردەکەوێ.

هەر ئەوەش وای لێکردووە کە حەز لە خۆشەویستی ئەفلاتوونی یان دووراو دوور بکات، چونکە ئەو ئێستا لە بەرانبەر وڵاتی برسیەتی مێ دەستە پاچە و بێکارە.

* دەیان جـار هێنابووتە بەرچاوی خـۆت چۆن ژنێکی باڵابەرزی پڕ لە ئەفسوون، بـانگی مـاڵی خۆیانی کـردوویت، بە پەنجە نەرموشلەکـانی، «جلەکانت دادەکەنێت» ئەستێرە ل ٤٩ . ....

* بەختی تۆ بوو یان ئەو ژنە تەنـیا و داماوە، ئاواترسی ناو گۆڕسـتان نسکۆی بە ئەسپ هێناو چوارمێخەی کێشا ؟! ل ٤٩ .

ئێمە ئەوە ناشارینەوە کە تا ئێستا لە چەمکەکانی ئێستاتیکە نزیک نەبووینەوەو بە پێکهـاتەکـانی رووداودا شۆڕبووینەوە ئەمـەش نزمترین حـاڵەتەکـانی لێـدوان و لێکۆڵینەوەیە، ئەگـەرچی چیـرۆکـەکـە لە حاڵەتێکی بەرزی گیرانەوەدایە و زمانی رووداو تا دواپلەی گوزارشت بەگەڕ خراوە بەڵام دیسانەوە دەبێ بۆ راڤەکردن و چوونە نێوی لەوخانە سەرەتاییانەدا بمێنینەوە.

## * ئەسپیدیلۆن (١٠٤- ١٦٢)

ئەگـەر نووسـەر پەیامـێک هەڵگرێ، ئەوە زمـان تاکـە کـەرەسـەی هەڵگری ئەو پەیامـەیە، پەیام بەو مـانـاباوەی ناکـە بیروڕاو ڕێرەوێک بێت، پەیام بەو هەستو نەست و خەیاڵەی نووسەر دەیبەخشێتە وشە. چونکە هەمـوو نـووسینێک کـاتێک زمـان و دەربڕین و وشەو پێکهـاتەو پەیوەندی رسـتـەکـانی دەبنە هەڵگری کـۆمـەڵێک مـاناو مـەدلوول

جیالەوەی لە فەرهەنگدا هەیانە، ئەوجا ئەو نووسینە دەچێتە خانەی (دەق) و دەکرێ بنیاتی لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر هەڵنێین.
هۆی سەرەکی (کورتی رەخنەمان) نەبوونی خوێندنەوەیەکی گشتگیری و سەربەخۆیە بۆ زمان، نەبوونی لێکدانەوەو بینینێکی فەلسەفییە بۆ زمان، بەبێ بۆچوونێکی قوڵ بۆ دینامیکیەتی زمان چوونە ناو دەق کارێکی ئەستەمە. هەرچەندە نەبوونی فەلسەفەیەک بۆ زمان لەلای نووسەرانمان یان تەنگی مانا حسیەکانی وشە لە دەقی کوردیدا مەیدانی رەخنەیان بەسادەیی و ئاسانی هێشتۆتەوە، بواری سەرهەڵدانی لێکدانەوەی جیاواز کەم دەکەنەوە.
ئەسپیدیلۆن- بۆ خۆی هەڵگری مەدلوولێکی فەلسەفی فراوانە و دەسەڵاتێک لەنێو دەقەکە دروست دەکات و نووسەریش لە حوکمەکانی بەدەرنییە.
- تۆ لە ئەسپیدیلۆن دەچیت.
- ئەسپیدیلۆن کێیە؟
- ئەسپیدیلۆن کەس نییە گیاندارێکی ئەفسانەیی ئاوییە، لە نەهەنگیش گەورەترە، ئەسپیدیلۆن کە دەکەوێتە سەرئاو دەریاوانەکان وا دەزانن وشکاییە، بارگەو بارخانەی خۆیان لەسەر پشتی دەخەن. بەڵام هەر ئەوەندە ئاگریان کردەوە... ئیتر خۆی دەجوڵێنێت و هەر هەموویان هەڵدەگرێت نقوومی ناو ئاویان دەکات «ل ١٤٧ چیرۆکی ئەسپیدیلۆن».
بە پشت بەستن بە پەیوەستەکانی وشە، ئەگەر بۆ وەرگرتن و لێکدانەوەی حاڵەتە دەروونییەکان پەنا بۆ شوێن بەرین، خۆمان بەرانبەر دوو شوێنی جیاواز دەبینینەوە یەکەمیان شوێنی نووسینی چیرۆکە، دووەمیان شوێنی رووداني چیرۆکە بەلەبەر چاوگرتنی شوێنی سێیەم ئەویش- پانتاییەکانی زەین و خەیاڵە- ئەگەرچی بۆ لێکدانەوەیەکی فراوانتر شوێنە زەینییەکان لە هەردوو شوێنەکەی دیکە گرنگترن.

* شوێنی نووسینی چیرۆکەکە دانیمارکە، شوێنی ڕوودانیشی هەولێرە- ئەوەی ئەو دوو شوێنەی پاراستووە، ئەوەی ئەو دوو شوێنە تێیدا بەیەکدەگەن شوێنی سێیەمە ئەویش- زەین و خەیاڵی- نووسەرە.
* ئەگەر شوێنی دووەم «کە شوێنی ڕوودانی چیرۆکەکەیە» ئەو شوێنەی نووسەر ماڵی لەسەر هەڵنابوو، وای زانیبوو وشکانییە وەک «ئەسپیدیلۆن» ژێر ئاوکەوتووە ئەو شوێنە ڕاستەقینە لە زەمەنێکی بەسەرچوو هەیە، بوونی ئەو شوێنە لە زەمانی ئێستادا «وەهمە». ئەو وەهمەی لە هەموو شتێک زیاتر لەواقیعەوە نزیکە.
* شوێنی یەکەم- دانیمارک- وەک بەشێک لە دنیاو جێگایەک بۆ نوسین، لە لای نووسەر، وەک کەسێکی دەم با، ئەویش ئەسپیدیلۆنێکە، دەشێ نەکەوتبێتە سەر ئاو.

## * زەمەن:

- زەمەنی نووسینی چیرۆکەکە بەسەر هەموو لایەکدا زاڵە، ئەو زەمەنەیە حاڵەتە دەروونی و فکرییەکان دیاری دەکات.
- زەمەنی ڕووداو کە زیاتر زەمەنی تەکنیکە، کە زیاتر زەمەنی تەمەنە، مێژووە. هەرچەند هەوڵدراوە- زەمەنی ڕووداو- لەو چیرۆکەدا ڕێکخرێ بەڵام بەسەرهات سرپویەتییەوە و گرنگییەکی بۆ نەهێشتۆتەوە.
دەشێ زەمەن و شوێن وەک ئیستاتیکا و جوانکاری بخوێندرێتەوە.
خەیاڵ- یان دەقەکانی زەین- دەکرا لە لێکدانەوەیەکی جیاوازدا هەیکەلی گشتی چیرۆکەکەی لەسەر دیاری بکرێ، بەهۆی فراوانی و درێژبوونەوەی بەڵام وەک پێویستییەکی ڕەخنەیی، خەیاڵ لەو چیرۆکەدا مەیدانی حەقیقی ڕووداوەکانە و چیرۆکی سەرەکییە. بوونی- هێڤان و دایکی- لە خانوویەکدا وەک واقیعی دیاری چیرۆکەکە، شتێک ناداتە خوێنەر بەڵام ڕووداوە خەیاڵییەکان، ئامادەیی- حەمە عەلی شاسوار- هەموو فەنتازیا فراوانەکانی دەوری- حەقیقەتێکی زۆر گەورە و

جوانکارییەکی شیاو دروست دەکەن.

* زمان لێرە ئەو دەلالەتانەی هەڵگرتووە کە هەناسە بە ژیانیان دەبەخشێ. لەنێو لێکدانەوەیەکی وادا ئەگەر بۆ مەنزڵی- ژن- و هەیکەلی ژن بگەڕێین بەبێ ئەوەی راستەوخۆ مەبەستی نووسەر بێت.

- هیڤان- کە کوڕە لاوێکە- لە هەموو ئەو ناسکی و جوانیانە هەڵدێ کە بەژنیانەوە دەبەستێتەوە. لە دەنگ و شێوەو حاڵەتی نەرمی دەروونی- ئەو هەڵاتنە وەدەرنانی- بوونی ژنە- بەرانبەر پیاو وەک داهێنەرو وەک وجوود.

- من خۆشم لێت ناشارمەوە، شێتی «جوانی» و «چاوشینەکانت» و «باڵا بەرز»ە کەتم.

ئەو سێ وشە «جوانی، چاوشینەکان و باڵابەرز» زمانی بە بەرز راگرتنی هونەرو دەنگ و سەدای کوڕە گۆرانی بێژێکی وەک «هیڤان» نین، ئەو وەسفانە، وەسفی جوانی جنسی «مێن» لێرەدا ئەو دەنگانە دەبیستین کە هونەری «ژن» تەنها لە جەستەو جنسیدایە، ئەوەش نزمترین تێڕوانینە بۆ ژن «ئەوەش بڕواو فەلسەفەی رۆژهەڵاتە بەرانبەر ژن» کارەسات ئەوەیە- کەسی یەکەم «هیڤان»- لەبەر ئەو وەسفانە هەڵدێ و نەفرەت لەوە دەکات کە دایکی ئەو سیفاتە ژنانیانەی پێبەخشیوە، هەر لە ناو نانییەوە تا نازکێشانی.

«من دایکشم ئێجگار وایلێکردم لە ئافرەت بچم.. لە بیرمە کە منداڵ بووم جلی کچانەی لەبەر دەکردم.. لە هەمووی سەیرتر ئەو تاکە گوارەیە بوو کە کردبوویە گوێچکەم، گوایا تاقانەو نازداری دەدامێ».

ئەسپیدیلۆن ل١٠٧ .

«ئاخر ئەوان نەیاندەزانی من بەقەدەر ناوەکەشم رقم لە شێوەو روخساری خۆمە» ل ١٠٦ .

* ئەو پەروەردەکردنە کە چیرۆکنووس لە جوانترین شێوەدا کێشاویەتی، لە نەستی هیڤاندا ئامادەییەکی پڕکێشە و بەردەوامی هەیە، ئەوەتا بە هەستێکی تەواو ژنانەوە، هەست بەو بێهێزییە دەکا و

لە دەروون و بوونیدا زاڵە و گیانی بە تەواوی داگیرکردووە. وەک ژنی ڕۆژهەڵات، ئەو ژنانەی هەمیشە بۆ - پیاوێک- دەگەڕێن لە پەنایان بێ، تەسلیم بە توونددو تیژی و رقی پیاو دەبێ.
جوانترین و توونترین حاڵەتی «پیاوانە»- زللەکەی حەمە عەلی شاسوارە- لەلای، هەر ئەوەش وای لێدەکات حەمە عەلی وەک باوک تەماشاکاو حەز بە لێدان و جنێودان و دەرکردن و هەتک کردنیشی بکات.
- (ئەی قوربانی ئەو دەستە پیرۆزەت بم «حەمە عەلی شاسواری» کە ئێوارەی ئەو زستانە سەختە وێنەکەیت لەسەر روومەتم نەخشاند، بەفیدای ئەو جنێوە نوقلّیانەت بم» ئەسپیدیلۆن ل١١٧ .
ئەو دەیەوێت- حەمە عەلی- بەو توندو تیژییەی ڕێگاکانی پیاوەتی پێشانداو ئەو قسە ساردانەی لەبیر بەرێتەوە کە بە درێژایی ژیانی بیستوونی، لە نێوان دیالۆگەکانەوە.. کە جێگایەکی باڵایان هەیە لە نووسینی دیالۆگ لە چیرۆکی کوردیدا- تێڕوانینی کۆمەڵ بۆ پیاوێکی «ئەتوار» ناسک تێدەگەین.
- تۆ بێدەنگ بە بووکە شووشەی ناسک.. ئەگەر باسی مایۆ وستیانی دایکە... بۆ دەکەیت بیکە،... ئێمە باسی پەیوەندی نێوان چەک و قەڵەم دەکەین، نەک هی دایکت و تیاترۆخانە، ل ١٠٦ .
- ناپیاو.. هەر بیچمت لە بیچمی.... دەچێت. ل١٠٦ .
- دایکە.... چاکی ناسیویت، بۆیە ناوی پیاوانی لێ نەناویت. ل ١٠٦ .
- لووسکەی وەکو تۆ هەر بۆ ئەوە باشە گۆرانی بلێیت، شاعیر کوڕی جوامێری گەرەکە. ل,١١٢
- بەم دەنگەتەوە دەتەوێت شیعر بخوێنیتەوە، دەڵێی دەنگی ژنی زەیستانە..؟ ل ١١٢ .
ئەو تێڕوانینە دەیگەیەننە دوا خانەکانی نامۆیی، ئەویش تینوی بوونی پیاوە لە تەنیشتی، لە ماڵی، لە ناخی، تابوون و بۆنی ژنی..

وەک بەژن بوون- لە ناخیدا بسڕنەوەو ڕێگاکانی پیاوەتی پێشاندەن. ئەو ڕێگا وەهمیانەی ڕۆژهەڵات ناباتەوە سەر خەونەکانی دەریا.

لەگەڵ هەموو هەوڵە جوانەکانی زماندا، کەشفکردنی باری دەروونیدا، لەگەڵ هەڵدانەوەو خوێندنەوەی دیوەکانی دیکەی مرۆ، هیڤان حاڵەتی ژنانەی لە کۆڵ نابێتەوەو بەبێ دەنگی و کپی، پیاوە غەریبەکانی دایکی قبوڵ دەکات. «لە ڕووداوەکانی خەیاڵدا». دەگاتە ئەو ڕاستییەی ئەو هەموو- مەتەڵە- بەو وەڵام نادرێنەوە، ئەوەش دەمانباتەوە سەر پرسیارێکی گەورەتر، مەتەڵەکانی ژیان هەرگیز تەواو نا ن، یان دنیا مەتەڵێکی گەورەیە.

* زەمەن هەر چەندە وەک «کاتێکی» بەرجەستە مامەڵەی لەگەڵدا کراوە بەڵام ئەو مامەڵە بەشێکە لە تەکنیک و لە دەلالەتەکانی زماندا ناخوێندرێنەوە، شتێک ناخەنە سەر پانتایی یان ئیستاتیکای چیرۆکەکە، بۆیە لە خوێندنەوەی چیرۆکەکە ئەو کاتە درێژەمان لەبەر چاو نەگرتووە.

* هەر هەموو چیرۆکەکانی لە دنیای ڕۆمان نزیکترن، بابەت و بنیات و کەرەسەو زمانیان لە خانەکانی ڕۆماندا زیاتر جێدەگرن.

* کەسی یەکەم لەهەر هەموو چیرۆکەکاندا، حاڵەتێکی بەردەوام، یان بوونێکی تاک بەندی- یان کەسی یەکەم لەهەر هەموو چیرۆکەکاندا تاکە یەک بونیادی فیکری و سایکۆلۆجی و فەنتازی هەیە، هەموو ئەو چیرۆکانەش جگە لە گێڕانەوەی حاڵەتەکان، هەوڵدانێکن بۆ کەشفکردنی زیاتری ئەو کەسایەتییە. بۆیە دەکرێ هەموو چیرۆکەکان وەک یەک ڕۆمان بخوێندرێنەوە یان تێگەیشتنێکی گشتی لای خوێنەر هەڵدەنێن کە مەحاڵە بتوانێ لەیەک پارچەیی چیرۆکان رزگاربێ. نووسەریش هەستی بەو حاڵەتە کردووە.

* هەموو چیرۆکەکانی ئەو کۆمەڵە چیرۆکە ئەوە هەڵدەگرن سەربەخۆ لەسەریان بنووسرێ و شایانی گرنگی پێدانن، ئەوە جگە لەوەی کە ئەو کتێبە بە خوێندەواری کورد بگەیشتبا لە ڕەوتی چیرۆکی کوردیدا

حسابێکی دیکەی بۆدەکرا.

* وەنەبێ ئەو شێوە نووسینە تەواو تازە بێ، زۆر لە چیرۆکنووسان لەو بابەتە کارانەیان هەیەو نزیکترین چیرۆکنووسیش لێیەوە مامۆستا شێرزاد حەسەنە، زمان و تەکنیک و خەون و فەنتازیایان زۆر لێک نزیکە بە جیاوازی بۆ چوون و دەربڕینیانەوە.

١- هەردووک زمانی گێڕانەوەیان هەست بزوێن و ناسکە.

٢- پاڵەوانەکانیان کەسی تەریک و نامۆو لانەوازەن.

٣- جنس وەک حاڵەت و دیاردە لە بونیادی چیرۆکەکەنیاندا زاڵە.

٤- شۆڕبوونەوە بە حاڵەتی دەروونی و شیکردنەوەی سایکۆلۆژی.

٥- هەردوو چیرۆکنووس دایالۆگەکانیان بەشێکی پتەوی تەکنیکن و لە ناخی خوێنەر جێگایەک جێدەهێڵن.

# راو لە نێچیری موکریدا:
## شکانی ئاوێنەکان یان ون بوونی کەسایەتی

* «نێچیر» دوا کۆمەڵە چیرۆکی موکرییە، چواردە چیرۆکی تێدایە، یەکەم چیرۆکی «مۆتەکە- ١٩٧٥» و دوا چیرۆکی «نێچیرە - ١٩٩٧» نووسراوە.

* ئەگەر بکرێ - لێرەدا- ناچینە نێو وردەکاری هەموو چیرۆکەکان، بەڵکو لە هێڵە گشتی و تەونە هاوبەش و درشتەکان و حاڵە نەفسییە دیارەکانی هەموو چیرۆکەکان دەدوێین، لەو ڕێیەشەوە دەتوانین شتێک لە نهێنی و وردەکارییەکانی واڵا بکەین. پێش ئەوەی لەو «هێڵە گشتییە» بدوێین دەبێ بڵێین.

* نیگەرانییەک، نیگەرانی نووسەر لە دوای هەموو وشەو رستەو هەیکەلی گشتی چیرۆکەکاندا دیارە. ئەو نیگەرانییەی دەرگایەکی نەهێشتۆتەوە بۆ سبەی. ئەگەر وەک سەرەتایەکی نووسین تەنیا لە نێونیشانی تاکە چیرۆکێکی شوێنکاری ئەو نیگەرانییە سۆراخ بکەین، بۆ نموونە «گوڵێکی سوور - ٢١-٢٨) کە دەشێ گەشترین نێونیشانی بێت، بەنێو هەردوو وشەی «گوڵێکی سوور»دا خەندەو ئاسودەییەک، ژیان و چرۆیەک دزە دەکاتە نێوەوەی خوێنەر، بەڵام هێندە تەمەن کورتە

کەرێ نادا هەناسەیەک بدات و هەمان نیگەرانی توندترو ئەستورتر دادەڕژێتەوە.

«گوڵە سوورەکەی سیس بووەتەوە، رەنگی گۆڕراوە، هەرگیز لەوە ناچێ تەمەنی «خونچایەتی» و ئاونگ و شەماڵی دیبێ و.... ل٢٢»

* هەر لە هەمان چیرۆکدا «سەری نێرە هەنگێکی مردوو» لێرەدا هەنگ وەک رەمزوجوانی، وەک بەردەوامی و کار وەک شتێکی نهێنتر لەوانە نەخراوەتەگەڕ، لێرە هەنگ تەنیا بۆ «مردن» ئامادەکراوە، هەنگێکی «نێر»، نێر بەمانای دەستوبردی و هەمەکارەیی و دەسەڵاتی رۆژهەڵات، دەشێ بە مردنی دەسەڵاتی باوک یان «شۆڕشی» لێکدەینەوە.

* پاڵەوانەکانی موکری لە نێچیردا بەلاو و پیرو ژن و کچیانەوە، بەجیاوازی ناو و رەنگ و شێوەیانەوە هەر هەموو تاکەیەک پاڵەوانن، تاکە یەک کەسن، ئەویش موکری بۆ خۆیەتی، یان دەکرێ بڵێین سێبەری موکری دەنێو هەموو کەسەکان وە دەنگ دێت.

* لێکدانەوەیەکی زمان، یان هەڵوەشانەوەی بونیادی زمان لێرەدا ناکرێ، تا هێڵەگشتییەکان یان رایەڵی درشتی چیرۆکەکان نەخەینە سەر ئاو، چونکە ئێمە لەو باوەڕەداین چیرۆکەکانی موکری بەبێ دیاری کردنی ئەو سەرەداوانە ناکەونە روو، هەیکەلی گشتی چیرۆکەکان ناخوێندرێنەوە.

*        *        *

## هێڵە گشتییەکان یان رایەڵە درشتەکان

١-دێڕێکی سەربەخۆیە

هێڵێکی گشتی یان رایەڵێک بەهەمان رەنگ و تواناوە، بەهەمان بونیادو زمانەوە، بەهەمان بۆچوون و سیماوە، کە دەتوانرێ بە بنکەی بیرکردنەوەی یان ناوەندی دەسەڵاتی «زمانی رووداو» دابنرێ، ئەویش لێک دابڕین و لەت لەت کردنی پارچەکانی لەشی مرۆڤە.

* سەرم لە ملم جیا کرایەوە (ل ٣٣ مۆتەکە»
* لاقێکیشم بەمشاری کول دەبڕنەوەو... «ئامێر دەکان- ل ٧٣»
* بەبێ سێ و دوو بە ملی خۆمم داهێناو سەرم لە ملم جیاکردەوە. «نیێچیر ل ٨٦»
* دگانم لە پەنجەکەم گیرکرد، تەنهایەک دلۆپ خوێنم داچۆراند «شەرمنامە ل ٩٣»
* بەچەند گرێ یێک سەری گلۆلە دەمارەکەی پێوە بەست «ل ١١٧ جۆلانە»
* هەر لە پڕ موسێکی دەرهێناو بەربووە دەمارەکانی لەشی... «جۆلانە»...... تاد.

ئەوە جگە لەوەی کە بونیادی گشتی و هەیکەلی چیرۆکی «جولانە» سەرتاپا گەمە کردنێکی بەردەوام و یەک لە دوای یەکە بە جەستەو خوێن و خۆڵ و ئێسقانی مرۆ.

* ئەو گەمە کردنە بە جەستەی مرۆو شێواندنی حاڵەتێکی زۆر ئاساییە ئەگەر باری کوردو کوشت و بڕیان لەبەر چاو بگرین، مێژوویەک لە کوشتن، مێژوویەک لە کۆچ، هەزاران ساڵ لەت لەت کردنی کورد وەک مرۆڤ و نەتەوەو وڵات، بۆیە زۆر سادە بەوەرازین کە ئەو پیرۆزییەی جەستەی مرۆ هەیەتی گەمەی پێبکرێ لەوەختێکدا نەتەوەیەک بە هەموو بەها پیرۆزییەکانیەوە، پیرۆزی مرۆیی، پیرۆزی نیشتمان، تا پیرۆزی ئایینە رەسەنەکانیشی لەسەر هەموو ئاستەکان قورسترین و جەرگبڕترین ئیهانەو ئەتک کراوە.

لەو حاڵەتەدا ئێمە داوای بەرگرییەکی ئاسایی یان مەعقوول و عاقڵانە لە نووسەریان هەر کەسێکی دیکە ناکەین، چونکە ئەو حاڵەتە جێگای شتی «مەعقول»ی تێدا نابێتەوە. ئێمە نابێ ئەوە لە بیربکەین کە موکری نەک زمانێکی بەرگری، بەڵکو بونیات و هەیکەلێکی بەرگریشی دروست کردووە، ئەوەش دەنێو هەموو وشەو تا لە فاریزەو خاڵەکانیشدا رەنگی داوەتەوە.

٢- سەعات

دەشێ بەکار بردنی سەعات لای زۆر لە نووسەرانی دنیا تەنیا وەبیر هێنانەوەی کات بێ یان لێکدانەوەیەکی فەلسەفی، بەڵام لای موکری سەعات مێژووە بە هەموو شتەکانیەوە، سەعات زەمەنە بەهەموو وەختەکانییەوە، سەعات حاڵەتێکە، فەزایە کە لە ون بوون، سەعات رەمزو بەردەوامی مێژووە، ئەو مێژووەی ئێمە جێگایەکمان تێدا چێ نەکردووە، راستە ئێمە فڕێدراوینە دەرەوەی مێژووی دنیا، «هەرچەندە مێژوویەکمان هەیە، رابردوویەکمان هەیە، زەمەنێکمان هەیە لە دەرەوەی زەمەنی باو لە دەرەوەی دنیاش بێ» لێرەدا موکری ئەو سەعاتە کە یەکێک لە دەلالەتەکانی «مێژووی دنیایە» خستوویەتییە ژێر دەسەڵاتێکی زۆر «میزاجي» بە ئارەزوو رایدەگرێ و کۆک دەکرێ و دەسڕێتەوە. ئەوەش گاڵتە کردنە بەو زەمەنەی کە ئێمەی سڕیوەتەوەیان وەدەری ناوین.

* سپرینگی سەعاتەکەی سەر مێزەکەم و... کاری کردبێتە سەر ئەندامەکانی لەشم و یاسای ژوورەکەم. «مۆتەکە، ل ٣٠»

* زەنگی سەعاتەکە بەشێوەیەک دەنگی دایەوە نەمتوانی بەرانبەر بەم دەنگە خۆم بگرم. (شەوێک ل ٨٩).

* سەعاتەکەت کۆک کردو قەیتانی پێڵاوەکانت توند بەست. «جۆلانە ل ١٠٢»

* مێزێکی بچووک سەعاتێکی بێ میلی لەسەردابوو. «ل ١٢٥ جۆلانە».... تاد.

٣- تۆپی نەخشەی زەوی

نەخشەی زەوی ئامادەییەکی بەردەوامی ئەو وڵاتانەیە کە شوێنێکیان لەسەر داگیر کردووە، هەرچەند چکۆلەو هیچیش بن. ئەو نەخشەیەی سەدەیەکە بانگێکی ناحەق و بێزار بە گوێماندا دەکا بانگی توانەوەو نەبوونمان. دنیای نوێ، دنیای پڕ زاناو فەیلەسووف، دنیای دراوسێکان بە «ئایینیانەوە، بەتواناو هونەریانەوە، بە پێشکەوتن و داهێنانیانەوە»

ئەگەر بۆ خۆیان سوودێکی هەبووبێ ئەوە بووە کە ئێمەیان پێکوشتووە، کە ئێمەیان پێ خەساندووە... تازەترین نوێنەری ئەو دنیا زاڵم و هیچە ئەو نەخشە پڕ شەرمەیە کە بە چەند هێلێک گەلێکی مەحف کردۆتەوە. چیرۆکنووس سەدان وشە وەکاردەخا، بگاتە ئەو حاڵەتەی بەنووکی پێلاوەکانی گەمە بەو نەخشەیە بکات، لە وێنەیەکی سریالیدا ریخەڵوو دەمارەکانی خۆی لێ پچێ... تاد. ئەو نەخشەیە وەک گومڕایەک ئامادەییەکی هەمیشەیی هەیە.

٤- سەربەخۆیە

حاڵەتێکی هیستری بۆ بەرگری و مانەوەو ریسوایی لە هەموو چیرۆکەکاندا هەیە زۆرمان نەوتووە کە بڵێین چیرۆکەکانی موکری نووسینەوەی مێژووی شۆڕش و بەرگری و نوشوستییەکانی کوردە، بەڵام ئەو هەوڵانە لە بازنەیەکی داخراو دان بەو حسێبەی ئێمە لە دەرەوەی دنیاین. ئەوەش هەموو پەلە قاژەی مەرگ و نەبوونە. وەک رەمزێک بۆ نابووتی و سڕینەوەی خود، وەک تیرێک بۆ سەر کۆنەو بە خۆدا چوونەوە «تف» باران. داواکردنی موکری لە خوێنەر، لە خۆی، لە هەموان بۆ «تف» بارانی ئاوێنەکانی سڕینەوەو ئیهانەکردنی ئەو بوونە لەرزۆک و پڕ خوێنەیە.

* تفێکی خەستت نووساندە نێو چاوانتەوە. «ل ١٠٢ نێچیر» .

* تف بارانی ئەو هێلە سوورو گێڕو گەواڵانەیم کرد، «تف... ل ٣٥» .

* تفێکی خەست و بەنگەوە.... رووخساری نێو ئاوێنەکەی سواخ دا ل٥٤.

* تف لەو ئاوێنە بێشەرمانە. نێچیر.

* تفێکی خەستیان لە مێژووی ئینسان دەکرد ل ١٠٨.... تاد..

٥- خوێن

ئێمە لە شەڕی خوێن داین، رقمان، خۆشەویستیمان، خواپەرستیمانە... بە خوێن براوەتەوەو بەخوێن بەسەرماندا سەپاوە،

سەعاتەکانمان، نەخشەکانمان، وڵات و خاکمان بە خوێن کاردەکەن، خوێنێکیان دەوێ نورت و نوێ و لەکوڵ.
٦- ئاوێنە.... ٧- عارەق ٨- ژوور.
* ئەو سەرەداو و رایەڵە درشتانەن کە موکری پانتاییەکی فراوانی لە هەر هەموو چیرۆکەکاندا بۆ تەرخان کردووە، ئەو دووبارە بوونەوانەش چیرۆک تووشی وەستان و داخرانێک دەکات فەزایەک بۆ بیرکردنەوە ناهێڵێتەوە.
* یەک سەمتی لە گەمە کردن بە «جەستەی مرۆ و لەت و پارچە کردنی» هەرچەند بۆ نەمر کردن و توانەوەی پیرۆزی مرۆیە لە لایەکی دیکەوە توخوبی زمانی دیاری کردووەو لە هەندێ باردا بەهۆی دووبارە بوونەوەی حاڵەتەکان زمانی خستۆتە بازنەیەکی داخراو.
* کەسەکانی موکری لەیەک کاتدا پیاوی ئازاو شۆڕشگێڕ و فیداکارو جەردەو پیاو کوژو خوێڕی و خۆفرۆشن، پیاو بەو وەسپە لەبەردەم توانەوەیەکی گشت گیری و بێ ئەندازدا، ئەوەش بۆ دەربڕین لە «نووسەر» یەک سەدەگریانی دەوێ.

* * *

* کە دەڵێین ئەو چیرۆکانە لەگەڵ کارەکانی دیکەی مامۆستای بەنرخمان موکری مێژووی خوێن و بەرگرین قسەیەک نییە لە هەوادا هەڵمانچنیبێ و یان رایەکی راگوزاری بێ. «شەرمنامە» کە نووسەر کردوویەتییە دوا ئاڵقە کە دوا ئاڵقە فکریشە «خەتمی»ی چیرۆکەکانی دیکەیە، ئەو خەندرکەیە کە تا نووسینی ئەو «شەرم» نامەیە خوێن و بەرگری و کورد پێیگەییبوون. هەرچەندە دەربڕینی بیروڕاو حاڵەتی نەفسی و واقیعی زاڵم هونەری بەرزی موکریان لە نووسین و وتار نزیک کردۆتەوە، بەڵام ئەوەش خەمی گەورەی موکرییە بۆ «بوون» لە سەلیقەی ئەو کەم ناکاتەوە.
* دوو جەمسەری لە کەسیەتدا، بە هیچ شێوەیەک مەبەستمان «الازدواجیة» نییە، لە موکریدا «وەک کەسی ئەو دیو پاڵەوانەکان»

دیاره. له لایەک نەمری خوێنی شەهیدان و لەلایەک تف له ئاوێنەکان، ئەو دوو جەمسەرییە کە بێ کەسی شاعیر تاقانەمانی گەیاندۆتە لووتکەی داهێنان و لووتکەی کەسیەتی دوو جەمسەر. بێ کەسی داری ئازادی و بێ کەسی «سەگ بووم وەڕیم» یەک بێ کەسن، بەڵام ئێمە وەک کورد داشۆرینەکانی بێ کەس بە جوانترین مێدالیا دەزانین. موکریش بەهەمان کەسایەتییەوە پەیامی خۆی دەگەیەنێ.

* هەموو ئەو هێڵە گشتییانەی دیاریمان کردن دەشێ ببن بە تەوەری لێدوان و لێکۆڵینەوە بۆ ئەو رۆشنبیرانەی دەیانەوێ لەسەر چیرۆکی موکری بدوێن. ببوورن.

# شاعیر لە بۆنی چیرۆکدا

ئەو تاڵە مووەی نێوان شیعرو پەخشان خەریکە هەڵپروزێ، سنووری نێوانیان خەریکە رەشەوەبێ، هەموو جوانییەکان دەیانەوێ بە زمانێک بپشکوێن پڕ لە سحرو نهێنی، ئەوە جگە لەوەی هەردوو دنیایەکە «شیعرو پەخشان بە چیرۆکەوە» بەدوای ئازادبوونێکی رەهادا دەگەڕێن، ئازادی زمان و تەکنیک و وشە و بیر. ئەو ئازادییەی

تێیدا بیروفکر وشە لغاو ناکەن و «واتای» لێ زەوت ناکەن. وشە لەو قاڵبە چووکەڵەو تەسک و نەفەس توونده دێتە دەر کە «گێڕانەوەیەکی سادە» یان «بیروبۆچوونێکی دیاریکراو» بەسەریدا دەسەپێنێ.

ئەوەتا شاعیرێکی خاوەن بیست و پێنج ساڵ ئەزموونی شیعر زمانی خۆی لە چیرۆکدا دەوەشێنێ. ئەو شاعیرە تینووەتی بە دنیای پەخشان ناشکێ و هەست بە کەلێنی ئەو بوارە دەکاو دەیەوێ ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوەو هونەرێک بنوێنێ ئەگەر نەڵێین دەرسێک دابدات.

«بۆنی تاریکی» کۆمەڵە چیرۆکێکی برای شاعیر (فەرهاد شاکەلی)یە، نۆ چیرۆکی گرتۆتە خۆی نووسەر لە پێشەکیەکی کورتدا زۆر لایەنی رۆشن کردۆتەوەو زانیاری بە نرخی داوێنی.

لە سەرەتادا دڵمان بەوە خۆش بوو کە زمان وەک شاژنێکی خاوەن دەسەڵات تواناو بەهای «لە دەست چووی» لەو چیرۆکانەدا وەرگرێتەوە،

بەڵام سەرەڕای توانای شایانی نووسەر ئەو دەسەڵاتە وەک پێویست نەدراوەتەوە زمان، چونکە هەر لە پێشەکیەکەوە تێدەگەین کە نووسەر بە دوای «شێوەیەک یان دەفرێکدا» دەگەڕێ کە «ئەزموونەکانی» تێدا هەڵگرێ تا دەگاتە ئەوەی «پاساوێک» بۆ رازی کردنی خوێنەرو خۆی لە بڵاوکردنەوەو نووسینیان بهێڵێتەوە. دەشێ نووسەر چەند هەنگاوێ چووبێتە پێش، دەشێ بۆچوون لای خەڵکانی دیکەش بۆ زمان گۆڕابێ، بەڵام ئەو هەنگاوە زەحمەت و گرنگەی ئێمە مەبەستمانە ئەوەیە کە زمان لە رەزالەتی ئەوە رزگار بکەین ببێتە «دەفر»، زمان ئەو جوانییەیە کەچ پاساو بۆ جوانییەکەی پێویست نییە.

* قەحپەو شەهید، لاپەڕە (٩- ٢٤): یەکەم چیرۆکی کۆمەڵەکەیە: دوو وشە، دوو دنیا، دوو سندوقی پڕ لە نامەی نهێنی و گەچڵاو. ناونیشانەکە سڕینەوەی هەموو ئەو بەها پیرۆزانەیە کە شەهید لە قەحپە جیا دەکاتەوە. دوای (٧٣)دێڕی پڕ شکۆ دەربارەی هەیکەلی بەرزی شەهید وشەی قەحپە لە پڕو ناکاو وەک دیوی دووەم و ئەڵتێر نەتیڤی شەهید بە دەردەکەوێ.

هەر لە سەرەتاوە نەخشەیەکی تۆکمەی بۆ هەر کامێکیان کێشاوە، جگە لەوەی ناونانێکی وا رێگەیەک بۆ تێفکرین ناهێڵێتەوە «خەبەرو حەدەسێک» بە هەموو چڵوپۆپەکانیەوە دەداتە دەستمان. جگە لە تەماشاکردنی «دەمی» نووسەر خوێنەر رێگەیەکی دیکە لەبەردەم دانییە.

ئەو سێ رستە «میکرۆفۆنێکی بەرزو بۆرو سەرخڕ دەمی پێوەنا، سەر «ەکەی» خستۆتە نێو گەڵی خۆی (ل١٣، ل١٤، ل١٥).

«بۆنی تاریکی» جگە لە دیاریکردنی دەوری کچەکەی سەرشانۆ و شەهید و تەواوی خەڵکەکە دەسڕنەوەو بوونێکیان لە پانتایی چیرۆکەکەدا نامێنێ. ئەو سێ رستە سێ خشتی یەک رەنگی روحی هەرەمی چیرۆکەکەن جووڵانیان بونیادی چیرۆکەکە دەتەپێنێ.

* لە بۆچوونێکی دیکەدا دەتوانین وەک نموونەیەکی سەرکەوتوو

بیخوێنینەوە کە تێیدا هەموو بەها ئەفسانییەکان تێکەڵ بوون.
* ئەو هەناسە باریکەی فەنتازیا جوانەی «بیرەوەری» خەریکە بیخنکێنێ گیانێکی دیکەی بە چیرۆکەکە داوەو خستویەتیە سەر پێ. ئەویش بە بەخشینی «زیندوویەتیەکی» پڕ واقیع، واقیعێکی هیچ بە وێنەی مامۆستا.
«وێنەیەکی گەورەی مامۆستا... ئێمە مات بووین ئەو پێدەکەنێ (ل ١٠) «بۆنی تاریکی»
«وێنەکەی مامۆستا زۆر گۆڕابوو، تەماشای کردم و چاوی لێ داگرتم (ل١٥) «بۆنی تاریکی»
* رازخانەی گومان لاپەڕە (٢٥-٤٦)
* لێرەدا چیرۆکنووس بێ ئاگا بونیادی چیرۆکەکەی لە سەر ئەوە هەڵناوە کە دەکرێ لە دڵێکدا «رق و خۆشەویستی»، «ئاو و ئاگر»، «خوداو شەیتان» جێگەی ببێتەوە.
هەرچەندە ئەوانە سیفاتی هەرە سەرەتایی مرۆن و نووسەر گومانیان لێ دەکات.
هەر زوو دەکەوینە نێو دنیایەک لە راڕایی و ئەندێشەو پەژارەو بێهومێدییەوە، وەختێک «کەسی یەکەم» هەست دەکات ژنەکەی «ئازادی» لێ زەوت کردووە «ئەو ئازادییەی بە ژنێک زەوت دەکرێ» کە «سێبەری پیاوە/ بۆنی تاریکی» رقێک لە ژنەکەی هەڵدەگرێ، بە نێوی فکری فراوان و داهێنانەوە دەیەوێ ئەزموونی خۆی دووبارە بکاتەوە بەوەی کە «ئازادییە بێ ماناکەی» بە ژنێکی دیکە بفرۆشێ بەو نیازەی کە ئەو وەک باوکە «ئادەم» نییەو «ئازادە» لە «هەڵبژاردندا» وەختێک ئادەم دەبوو هەر «حەوا» هەڵبژێرێ. بێ ئاگا لەوەی کە ئازادییەکەی هەرچەندە رەهابێ هەر دەبێ «حەوایەک» هەڵبژێرێ.
* بێجگە لەو بونیادە «رووکەشە» کە سەرتاپای چیرۆکەکەی گرتۆتەوە.

بونیادێکی ناوەکی چیرۆکی «رازخانەی گومانی» زۆر بە توندی بە چیرۆکی «تەرم»ەوە گرێ داوە.
لە هەردوو چیرۆکدا «جەدەلیێکی» قووڵ و پڕ فکرو فەلسەفی دەخاتە روو، بەڵام بە دوو دیوی جیا.
١- نیگەرانی و ترس و گومان لەو «منداڵ»ەی جارێ هەر لە دنیای نەبون دایەو پەیوەستی هیچ بیرکردنەوەیەک نییە. «هەشت مانگ بوو ئافەریدەی دزێوی گومان دەبزوا. (ل ٣٥). بۆنی تاریکی» ئەو ترسی باوکە، ترسێکی هونەرمەندانە لەو نەوەی کە دێت و «بەرەی ژێر پێی رادەکێشێ» ئەوە جگە لەو بیرکردنەوە هەمیشە ئامادەی کە کوڕ باوک بە خاک دەسپێرێ.
٢- دووەم دیوی فەلسەفیانەی کە لە «تەرم»دا دارێژراوە، دەسەڵاتی باوکە.
دەسەڵاتی بە هەیبەت و پیرۆزی باوەک. ئەو دەسەڵاتەی نەک بیری داهێنان و فکری نوێی لە جەستەی منداڵدا خەساندووەو ئێسکی هاڕیوە، ئەوەتا کاردانەوە فسیۆلۆژییەکانی خۆی دەسڕێتەوەو دەڵێ «باوکم بۆنی کردووە، زۆر ناخۆشە، زۆر زەحمەتە بەو شێوەیە باسی باوکم بکەم. (ل٩٣) «بۆنی تاریکی»
* تەرم دوا چیرۆکی کۆمەڵەکەیەو شوێنێکی دیاری لە دنیای چیرۆکنووس داگیرکردووە، لە ژمارەی «١٣» تایبەت بە چیرۆکی گۆڤاری رامان بڵاوکراوەتەوە، برام «نەجات حەمید ئەحمەد» نووسینێکی شایانی لەسەر نووسیوە. بۆیە بە پێویستی نازانم لەسەری بدوێم.
* چیرۆکی «میرزاو کابرایەکی بێگانە» ناتوانین لە چیرۆکنووس جوانتر بیناسێنین کە دەڵێ «لە سەرەتای ساڵانی هەشتادا خووم دابووە گرام گرین، حەزم دەکرد هەموو خەونەکانم بە زیندوویی بگرم، کەچی تەنیا ئەو دوو چیرۆکە بوون بە داوی چیرۆکەوە. (ل٧)»
* نوورە شوشە، دوو رووداوی مێژوویی.

هەرتک چیرۆک گێڕانەوەیەکی سادەو پڕ ڕووداویان هەیە. هەرچەندە نوێ بوونەوە بە خۆیانەوە نابینن، بەڵام جووڵانی ناخی کەسەکان هەردوو کەسەکان هەردوو چیرۆکی زیندوو هێشتۆتەوە.

* قۆندەرە (ل ٨٥- ٩١)

ئەو چیرۆکە وەک سەرە قەڵەم نووسراوەو گرنگی پێنەدراوە، بەڵام سەرەتایەکی زۆر ڕەندە بۆ چوونە ناو کەسایەتی و کەشف کردنی نهێنی لە ڕێگەی شتەکانەوە.

بەو پێیەی «شتەکانمان هەرچەندە لێک بچن بۆنی ئێمەیان لێ دێت» بە رای من خوێندنەوەی شتەکان و دەنگ هەڵبڕینیان جۆرە تەکنیکێکی قووڵ و پڕ دەلالەتە نەک لە چیرۆکی کوردیدا لە جیهانیشدا غەدری لێکراوەو حەقی خۆی نەدراوەتێ.

* ئەوەی ماوە بیلێین «ئەو کۆمەڵە چیرۆکە هەر چەندە لە دەرەوەو لە غەریبی نووسراون و بڵاوکراونەوە، کەچی ڕەگ و ڕیشەو بۆن و بەرامی هەر هەموویان ڕەنگدانەوەی ئێرەن و ئەزموونی دەرەوەو بۆنی غەریبی لە ناویاندا نەتواوەتەوە».

# هەژان لە سێبەری زماندا

ئەو ئیقاع و سیحرو ختوکەی زمان لە شیعردا ونی کردووە دەبێ لە چیرۆکدا بیدۆزێتەوە، ئەو زمانەی دەلالەتێکی نوێ و سیحرێکی ئاوس بە وشەکان نەدا چیرۆکی پێ نانووسرێتەوە. چیرۆک لەو جوغزە دەرچووە کە تەنیا نووسینەوەی، یان چووکەڵە کردنەوەو گەورە کردنی حاڵەتێک بێت و بەس. ئەورۆ چیرۆک وەک بروسکەی نیوەشەوە ئەگەر بۆ ساتێکیش بێت دنیا رۆشن دەکاتەوە.

* «هەژان» کۆمەڵە چیرۆکێکی برای چیرۆکنووس (کەمال عەبدوڵا)یە (کاروان). شەش چیرۆکی کورتی گرتۆتە خۆی لە نێوان ساڵانی (٩٨٥- ٩٩١) نووسراون. لە سوید ساڵی (١٩٩٢) چاپکراوە.

* «نامەیەکی بەپەلە» درێژترین چیرۆکیەتی و چل و دوو لاپەڕەی داگیر کردووە. برای نووسەر لەو چیرۆکەدا بێ پەروا کۆمەڵە رستەو وشەیەکی زۆری تێدا بە خەسار داوە بێ ئەوەی دەلالەتی شتێکی نوێ بن، جگە لە وەسفێکی دووبارە بوەی حاڵەتەکان. هەر چەندە بە تەواوی بێ هومێدی نەکردوین و لە تاکە حاڵەتێککدا دەلالەت و مانایەکی نوێی بە «تۆپەڵە بەفر» داوە.

* (خۆدیتت چەند بە گوڕەوە تۆپەڵە بەفرەکەتم هەڵگرتەوەو خستمە نێو پەنجە لەرزۆکەکانم؟ بە ئارەزوویەکی چەند سەرسامەوە تێرو پڕ بۆنم

کرد، دەزانی وام هەست دەکرد بۆنی پەنجەکانتی هەڵگرتووە؟ هەژان-
٧٣).

* ئەو چیرۆکە تاکە کەسێکی «بێ سیما» دایپۆشیوە و ئەو نەسرینەی کە باسیشی دەکات وێنەیەکی کاڵی خۆیی و سێبەرێکی لەرزۆکی ئافرەتە. وەک هەر «کچێکی کورد» چاوەڕێی «ئازادێک» دەکات. ئەو چاوەڕوانیەی نیوەی کەسیەتی پیاوی رووخاندوەو هی خۆشی رەشکردۆتەوە.

* هەرتک «کەسەکان» گشتین و تایبەتیەک بە خۆیان دروست ناکەن تا خوێنەر بتوانێ وێنەی «خود»ی* تێدا ببینێتەوە.

* بە تایبەت کردنی حاڵەتەکان و کەسەکان ئەو کۆڵەکە زێڕینەی چیرۆکەکە «نامەیەکی بە پەلە» لێی بێبەشە.

* «هەژان» دووەم چیرۆکی درێژیەتی و (٢٣) لاپەڕەی داگیر کردووەو بۆتە ناونیسانی کتێبەکەش.

سەرەتای ساڵی (١٩٩٢) نووسراوەو هەرچەندە «نامەیەکی بە پەلە» کاتی نووسینی نە نووسراوە بەڵام وەخت لە نێوان ئەو دوو چیرۆکەدا «وەختی نووسینیان» تێکەڵە.

گوڵە لە هەژاندا هەر ئەو نەسرینەیە کە لە نامەیەکی بە پەلەدا ئامادەییەکی نادیاری هەیە. چیرۆکنووس بە هیچ شێوەیەک نەیتوانیوە نەفەسێکی جیاواز لە نێوان «گوڵە و ئازاد»دا دروست بکات کە بەحساب دوو کەسی دوو چیرۆکی جیان.

١- ئەگەر تارمایی کەسێک گوڵەی بانگ کردبێ.

١- ئەوە نامەیەک ئازادی پەلکێش کردووە.

٢- ئەگەر تەقینەوە و هەژانی دنیا گوڵەیان روو بەرووی مردن کردبێتەوە.

٢- ئەوە «لافاو و داڵەکە» تەنگیان بە ئازاد هەڵچنیوە و مەرگیان پێشان داوە.

٣. ٣. لە هەردووک حاڵەتیشدا (تەقینەوەیەکی دەروونی یەک بێن)

دروست دەکات، لەبەر زاڵبوونی چیرۆکنووس بەسەر هەردووکیاندا زمان و دەلالەتەکان وشەیان لە حاڵەتێکی زۆر گشتیدا راگرتووە.

* «رێگای سێوان» کورترین چیرۆکی کۆمەڵەکەیە دوای «دوا سەردان» ئەگەر ئەو هەموو رستەو پەرەگرافە بابەتیانە نەبان دەتوانرا بە چیرۆکێکی سەرکەوتوی دابنێین.

ئەو رستە بابەتیانەی چیرۆک دەکوژن.

- «حەمە» بە بێزارییەوە جگارەیەکی دەرهێناو بەر لەوەی لە نێوان لێوەکانی گیر بکات، ئاخێکی خەفەتباری هەڵکێشاو بە دەستێکی لەرزۆکیشەوە دەنکە شقارتەیەکی دەرهێنا، جگەرەکەی داگیرساند... تاد، «هەژان لاپەڕە ١١» هەر لەو چیرۆکەدا چیرۆکنووس جارێکی دیکە هومێدێکی دیکەمانٰ دەداتێ، کە دەشێ بە چەکەرەی ئەو زمانەی دابێین کە دەشێ لە داهاتوودا لە دنیای چیرۆکنووسدا بخولقێ.

وەختێک بۆ تەفسیری دەروونی ناخی «حەمە» دەلالەتێکی نوێ بە دەوروبەر دەبەخشی.

* تاریکێ شەو و حەیا رژان و چەکێکی لوولە بە قوڕ.

* بە دەستڕێژێک پەردەی تاریکی و لەشێکی ناسکی کون کون کردو قەترەی حەیا رژانەکەشی کردە هەڵم.

* هەستی کرد پێستی لەشی وەک کیفێک لە بەدەنی جیا دەبێتەوە.

«حەمە» نموونەی ئەو گەلەیە کە تا ئێستەش ناموس و حەیای بە باچوویان بە خوێنی ئافرەت دەشۆنەوە. ئەو ناموسەی کە هەرگیز ناشورێتەوە.

* تۆی ئێستە... ئەوەی دوێنێ. سێیەم چیرۆکی کۆمەڵەکەیەو (١٠) لاپەڕەی داگیر کردووە... ناونیشانی چیرۆکەکە تەواوی ماناو مەغزای چیرۆکەکەی هەڵگرتووە.

نهێنی چیرۆکەکەی خاو کردۆتەوە.

هەر چەندە بنیادی زمانی چیرۆکەکە لەسەر «دۆزینەوەی نهێنییەک» رۆنراوە بەلام پەلە کردنی چیرۆکنوس لەسەر روو هەڵماڵینی وشەو

رووت کردنەوەی واتا زمانەکەی پوچەڵ کردۆتەوە. هەر لە کۆتایی دێڕی دووەمدا چاوەڕوانی خوێنەری بە ئەنجام گەیاندووەو چیرۆکەکەش بە پایان.

- لە نیگا نهێنی و پڕ دیقەتەکانیدا وا دەردەکەوێ کە بەراوردێک لە نێوان منی نێو خەیاڵی و منی دانیشتوو دا بکا. (هەژان- ٢١) راقەکردنی هەرتک «منەکان» بێ هومێدیەک دێنێتە گۆڕێ و بە دوادا گەڕان و نیگەرانی خوێنەر دەکاتە هیچ و شتێک نامێنێ خوێنەر بە دوایدا بگەڕێ.

* بە گشتی زمانی چیرۆکەکان مژدە بەخشن ئەگەر وشەکان لە رووت بوونەوەی مانا بپارێزێ.

چونکە دەتوانین بڵێین، تا ئێستە چیرۆکی کوردی لەجیاتی لێواو لێوکردنی زمان و وشە لە سیحر و مانا خەریکی پرۆڤە کردنە بە رێکخستنی وشەو سینتاکسی رستەکان.

* ناکرێ چاویش لەوە بپۆشین کە ئەو زمانەی رەنجی فەرهاد و توانای بێ ئەندازی شاعیرانی کۆمەڵەی روانگەی «بەهەدەر» داو هیشکی کردنەوە لێرەدا کەم و زۆر رەنگی داوەتەوە.

بەڵام سەد شوکر ئاوارە بوونی چیرۆکنووس بۆ ئەو دیوو گەڕان و تێکەڵ بوونی ئەو رەنگدانەوەیەی تارادەیەکی باش کەم کردۆتەوە..

* ئەمساڵ ساڵی هاتەو بەروبوومی وەرزە نەزۆکەکان لە تامی دەمت دەدرومەوە.

* چاوەکانم یەکپارچە نیگاکانتی لێ رواوە.

داوای لێبوردنمان بۆ برای چیرۆکنووس کە دەشێ پەلە کردن و کورت نووسین لە هەندێ شوێن راقە و ورد بوونەوە لە دەسەڵاتی جوانی نووسەر بەسە زمان و هونەردا بەسەرماندا تێپەڕیبێ.

# چوارنان

«چوارنان» یەکەم کۆ- چیرۆکی بڵاوکراوەی بەڕێز (جەزا چنگیانییە)، نۆ کورتە چیرۆکی گرتۆتە خۆی. نووسەر جگە لەوەی ئەو بەرهەمەی پێشکەش بە باوک و دایکی کردووەو پێشەکییەکی کورتیشی بۆ نووسیوە ئەگەر پێشەکی نووسین دەرگایەک بێت بۆ چوونە نێو چیرۆکەکان «هەر چەندە سەردەمێکە باوی نەماوە» ئەوە لێرەدا کاک جەزا بەو پێشەکییە دەرگایەکی فراوانی نەک لەسەر چیرۆکەکان، بەڵکو لەسەر بیروبۆچوون و فیکری گشتی خۆی کردۆتەوە.

ئەو پێشەکییە ئەوەمان پێدەڵێ کە نووسەر بە هەستێکی ئاگادارو بەرنامەیەکی دارێژراو دەیەوێ بەشداری لە پرۆسەی نووسین و شۆڕشی رۆشنبیری کورد بکات کە درەنگ یان زوو، دەبێ بکەوێتە سەر پێ. جەزا دەنووسێ: «من مرۆڤی سەردەمی خۆمم و هەر کولتورو مەزهەب و فەلسەفەیەک منی مرۆڤ و مرۆڤانی تر بچەوسێنێتەوە دژی دەنووسم و دەوەستم «چوارنان، لاپەڕە ٥» وەک راو بەرنامە، ئێمە رێز لەو بۆچوونانەی برای نووسەر دەگرین، بەڵام هونەرو داهێنان پێویستییان بەو راپێشوەختانە نییەو دەنگی خودی چیرۆکەکان لە پێشەکییەکە بەرزترو جێگرترن. نەک چیرۆکی کوردی، گۆرانییە هەرە سەرەتاییەکانمان دەرگایەکیان لەسەر چێژی سێکسی ئافرەت کردۆتەوە با ئەو دەرگایە سادەش بێ، بەڵام کوتراوە. دواتریش چیرۆکنووسانی

کورد باش چوونە پێش سێکس پانتاییەکی دیاری لە رووبەری چیرۆک داگیر کرد.
ئەو داب و نەریت و یاساو کلتوورە.... رێگای پێشکەوتنی نەک ئافرەت، کۆمەڵگای کوردی وێکهێناوەتەوەو هەناسەکانی ژیانی کپ کردووە. بە ئالیەت و کەرەسەو بناغەو بنەمایەکی ناوخۆو دەرەکی پتەو و بە بەرنامەی دارێژراو کار دەکات، بەرەو رووبوونەوەو خۆ ئامادەکردنێکی تۆکمەتری دەوێت. لەو نۆ چیرۆکەدا جگە لە «خەونەکان مەسوتێنە، دایکێکی برسی، چوارنان» دەنا هەر شەش چیرۆکەکەی دیکە بۆ رووهەڵماڵین لەسەر نهێنی سێکس و چەوسانەوەو رووشکانەکانی ئافرەت بنیات نراون. لەو بوارەدا چونکە چیرۆکنووس بە وردی کاری کردووە «وەک مەبەست و فیکر» توانیویەتی ئامانجەکانی خۆی بپێکێ و گوڵێک لە بیابان برووێنێ.

* * *

* **شێخ تەها:** یەکەم چیرۆکی ئەو کۆمەڵەیە، بەشێوەیەکی ریالیزمی تەقلیدی یان ریالیزمی رووت، وێنەی خێزانێکی کڵۆڵ و یەکێ لە چەوساوەترین ئافرەتمان بۆ دەگرێ. شێخ تەها کە لە ژێر باری گرانی رۆژگارو چەوسانەوەی کۆمەڵ دەناڵێنێ، رقی خۆی بەسەر خێزانەکەیدا دەبارێنێ، نووسەر سەرەتا پشت ئەستوورە بەو رایەی کە «لەو کۆمەڵگایەی ئافرەت تێیدا دیلە، پیاویش تێیدا ئازاد نییە» وەک هونەر، ریالیزم دوا بەخشیشی خۆی داوە، سەختە بونیادی داهێنانێکی «عومربڕ» لەسەر ریالیزمی تەقلیدی رۆبنرێ. ئەو ریالیزمەی خەونەکانی مرۆی تێدا ناپشکوێ، چیرۆکیش دەکاتە عەبدێکی بەستەزمان. «مامۆستا قزڵجی» لە چیرۆکی کوردیدا رابەری ریالیزمە جگە لەوەش ئەو رێبازە گەورەترین پانتایی لە چیرۆکی کوردیدا داگیر کردوە، هیچ چیرۆکنووسێکی کورد نابینیەوە لەو بوارەدا کاری نەکردبێ.
* چیمەن: چیمەن دیارترین چیرۆکی ئەو کۆمەڵەیە، زمان جگە

لەوەی وەک ئالەتێکی دەربڕین وەگەڕ خراوە، توانیویەتی ببێتە هەڵگری حاڵەتە نەفسی و گەرمەکانی چیمەن.
- با سنگ و مەمکت ببینێ، پیاو شێتی سنگ و مەمکی ئافرەتە..... ل٢٧
- تۆزێ بۆن لە خۆت بدە، بۆن ئارەزووی پیاو دەهەژێنێ....
- ئادەی کوا تاراکە بیدە بەسەرتدا.... کچم پیاو بە تارایەکی سوور تۆوی دەتکێ
(چوارنان- چیمەن) ل٢٧
بنیادی ئەو چیرۆکە لەسەر نهێنی پێکهاتەی سێکسی ئافرەت رۆنراوە، بەو دەلالەتەی کە هەموو ئەندامەکانی لەشی ژن نابێ باسبکرێن و نهێنین. نەک لە دێیەک لە شاری گەورەو ئاوەدان، لە وڵاتی پڕ خوێندەوارو خاوەن بڕوانامە «ژن» سڕڕێکەو باس کردنی وڵاتی ژن ئابڕوو چوون و نامووس تکانە.
چیمەن وەک گیانەوەرێکی بەستەزمان تەسلیمی خواستی کۆمەڵ و حەزە شێواوەکانی «حەمەتاڵ» دەبێ، بەڵام چونکە ئەو دوو دنیایە، دنیای جوانی و خۆشەویستی و دنیای گەڕەلاوژەو رق، زۆر پێک نامۆن و لێک دوورن، ئەو تەسلیم بوونەشی بەهێند هەڵناگیرێ وشەهید دەکرێ.
* ژنێک کە هێندە سەر کۆنە کراوە، تا خۆشی نهێنییەکانی لەشی خۆی نازانێ، بەڵام «پاکییەکی رەها» لە ناخیدا هاوار دەکات
- نە بەخوا.. بەسی جزمەی قورئان لە ژیانمدا پیاو دەستی بەر لەشم نەکەوتووە. ل٣١
* نەگبەتی کورد لەوەدایە تا تاوانە هەرە شورەییەکانیشی بە حاڵەتی بە کوردبوونی گرێدراوە، حەمە تاڵ دوای کەتنەکەی «بووە بە جاش» ل٣٤
ئەو دوا رستەیە گۆڕانێک نییەو تەنیا رستەیەکی گوزارەیەو دەربڕینی حاڵەتی «حەمەتاڵە» دەنا دەکرا حەمەتاڵ بووبایە پێشمەرگە یان هەر

شتێکی دیکە. زەبروزەنگی پیاو لە کۆمەڵگای رۆژهەڵات هەرگیز پێوەندی بە باری سیاسی ئەو کەسەوە نەبووە، چونکە سیستەمی دین و کۆمەلایەتییەکە لەهەموو بوارەکانی سیاسەت وەک سوڵتان چۆکی داداوەو بواری گۆڕانگای و بیرکردنەوە خنکاوە.

* * *

* ئاوێنە. شۆڕبوونەوە بە ناخی «کچدا»، وێنەیەکی تەواو نزیکی «کچانی» کوردە، ئەو کچانەی لە ژێر زەبری «نێر»دا دەناڵێنن.

«ئازاد چەنگی لە قژە خاوە درێژە خەنەییەکەی گیر کردو بە... ل٤٠»

ئەو رەفتارانەی ئازاد تەواو ئاسایین. ئەگەر بزانین لەسەر دەستی باوکی جوانترین وانە دەخوێنێ «کوڕم ئازاد ئافرەت لە جیزەی ئاژەڵن خواو پێغەمبەر و قورئانی پیرۆز.... بە نیوەی پیاو دایان ناون» ل٣٨

ئەوانە نموونەی هەرەسادەی پیاون، لە کۆمەڵگای «زاڵی نێردا» بەلام هەست و ئارەزوو پێویستییە سێکسییەکانی «نەرمین» نەک تەنیا خۆی چیرۆکنووسیش و مامۆستا رەوف حەسەنیشی بە هەڵە بردووە ئەگەر وا هەست بکەن «پیاو هەموو وەک یەک نین» دوای ئەو خۆشەویستییە بێ ماناو سێکسییەی «هۆشیاری» جیرانیان بکەوێ.

راستە ئەوانە تەڵەی رۆژگارن و هەموو تێی دەکەوین، بەلام دەبێ ئەوە بزانین، جیاوازی نێوان «پیاوەکان» شتێکی رووکەشە «پیاو هەرگیز واز لە دەسەلاتی رەهاو زاڵمانەی خۆی ناهێنێ» چونکە ئەو دەسەلاتە پشت بە بنەما سەرەکییەکانی ئابووری دەبەستێ و پیاو بەرەنجی سەدساڵەی بە دەستی هێناوە.

* ئازادیش لە حاڵەتە سێکسییەکانی بۆ نموونە لەگەڵ خوشکی هوشیار نەرم و نیانە، بەلام پیاو لەکاتی پێویستیدا ئەو سۆزو خۆشەویستییە بە پولێ ناکڕێ و دەسەلاتی ئامادەی بەکار دێنێ.

* خۆشەویستی یەک مەوداو یەک رەنگ و هەتاهەتایی رۆژهەلات دوا تەوقی پیاوە لە گەردنی ئافرەتی کردووە.

* * *

## کۆتایی

ریالیزمی تەقلیدی: لە هەموو چیرۆکەکاندا پشتی بەو چەکە ئەستوورە، توانیویەتی بۆ دەرخستنی حاڵەتە نەفسی و شاراوەکان وەک هونەرێکی زیندوو وەگەڕی خات و بنەمای چیرۆکەکانی لەسەر هەڵنێ.

- رەگەز «مێ»: ئەو دنیا کاریگەرو گەرم و پڕ کێشەیەی ئاگر داوەو یەکێک لە دیوارەکانی دین و کۆمەڵگای وەبەر مستان داوە.

- زمان کارێکی هەمەلایەنی بۆ نەکراوە، وەک هونەرێکی سەر بەخۆ نەجووڵاوە، زۆر بەسادەیی «هەتا هەوڵی نەداوە لە بەکارهێنانی وشەو پێکهاتەی رستەدا لە ناوچەیەک بچێتە ئەو دیو» وەک زمانی چیرۆکیش تایبەتییەکی نییە، ئەوەش لە دەستدانی رەنگینترین گوڵی چیرۆکی ئەورۆیە.

- گفتوگۆ: چیرۆکنووس وەک ئەرکێکی مرۆیی و نیشتمانی تەماشای پرۆسەی نووسین دەکات و ئاستی هوشیاری ئەو کۆمەڵگایەشی خوێندۆتەوە کە لە دوا پلەی زیندەگی، ژیان دەباتە سەرو بەسادەترین کەناڵی گفتوگۆ لە گەڵیان دەدوێ.

- سێکس بۆ سێکس: زۆران دەڵێن نابێ سێکس هەر بۆ پیشاندانی سێکس باس بکرێ، بەڵام ئێمە بەلامانەوە شورەیی نییە کە بەبێ هیچ مەبەستێک و تەنیا وەک جوانکارییەکانی سێکس پیشان بدرێ، چونکە ژن بۆ خۆی تەواوی ژیانی مرۆی داگیر کردووە، وەدەرنانی لە خانە رۆشنەکانی ئەدەبدا مانای سووتاندنی جوانترین و ناسکترین مێرگی زیندەگی و مانای مرۆیە.

# خەمەکانی پایز
# پایزی ژن یان سپێدەی وشە

بە نیازی کردنەوەی دەرگایەک، پەنجەرەیەک بۆو دیو دنیای پڕ نهێنی ژن و ئەودیو فەلسەفەی ڕۆژئاوا قەڵەمێکمان لە (خەمەکانی پاییز) وەدەردا.
بواری کارکردنی (ڕێواس خان) دەتوانین بڵێین ڕووداوەو بەس، ئیدی ئەو ڕژانی وشەو ترازانی شعورەش لە پەراوێزی ڕووداوەکانیدایە، بەڵام ئێمە لەو نووسینە نیوەچڵەشدا بەڕێی چیرۆکنووسدا ناڕۆین و خانەکانی ڕووداو وەک (ڕووداو) ناخوێنینەوە هەرچەندە نووسەر لە ڕاوکردنی حاڵەتی گەیوی ڕووداوەکان و بۆسەی ڕۆژگاردا سەرکەوتووە.
* ئەگەر بواری کارکردنمان لەو دەقانەدا لە پرۆسەی بەکاربردنی زماندا بخەینە گەڕ دیسانەوە دەبێ وەک سەرەتاکانی نووسین خەریکی پێداچوونەوەی سینتاکس و پێهاتەی ڕستەو توانای دەربڕینی ڕووداوبین و لەو گۆمە داخراوانەدا خۆمان بخنکێنین.
چونکە لەو دەقانەدا پرۆسەی زمان وەک ئێستاتیکا شوێن کارێکی نیە. بۆیە دیسانەوە ناچارین ڕێیەکی دیکە هەڵنێین بۆچوونە نێو دەقەکانەوە کە ئەویش دەشێ خۆ هەڵواسین بێ بە (وشە)و بەس.

### سەرەتا (خەمەکانی پاییز)

(پاییز) ئەو ولاتە رەنگ زەردەی پێویستی بە هەموو شتێک هەبێ بۆ ڕاڤەکردنی پێویستی بە (خەم) نیە دەشێ نووسەرو خاوەن بیران زۆربان لە پاییز قەرز کردبێ، بۆ دەربڕینی (خەم و ئەندێشەی) خۆیان بێ ئەوەی ئێزافەیەکی هەر چووکەلەیان بۆ (پاییز) کردبێ، بە کورتی ئەوەی پاییز نایەوێ بۆ ناساندنی (خەمە)، جوانترین ئێزافە بۆ پاییز لە ئەدەبی ئێمەدا کرابێ ئی سەر دەستەی شاعیرانە (گۆران) کە دەڵێ:

**پایز... پایز...**

**بووکی پرچ زەرد**

داهێنان و بازی بوێری لێرەدا ئەوەیە کە پایز (بووکە) ئەو سیفەیەی کە پایز بە خەویش بەخۆیەوە نەدیوە.

* خەمەکانی پاییز لێرە وشەیەکی چووکەلەیە، وشەیەکی داخراوە (خەم) بۆ ڕاڤەکردنی (پایز) پایزێکی کراوەو فراوان و پڕ مانای جیاواز بەکارهێنراوە.

وەک ئەوە وایە بلێی (سپیایەکانی بەفر) یان. (تەڕی باران) بە جیاوازی لە واتادا.

لەو دەلاقەیەوە ناچارین لە سێ کوچکەی (مردن. خەم. پایز) بچینە نێو دەقەکانەوە. کە هەرسێ وشەش لە بونیادی گشتیاندا هەمان بوعدی واتایان هەیە.

**١- مردن:**

مردن لە هەموو چیرۆکەکاندا یان (سەرەتایەکە) بۆچوونە نێو دنیای ڕووداوەکان یان ئەنجامی ڕووداوەکانن.

ئەو مردنانەی هیچ مانایەک نادەن، مردن لێرەدا تەنها سڕینەوەی ژیانەو دیوێکی ون و نەدیوو تاریکە. مردن تەنها وەک پەردەی شانۆ بەکارهێنراوەکە ڕووداوەکان دادەپۆشێ. تاکەمردنیش کە لەوخانە داخراوە دێتە دەرێ، لە هەموو مردنەکانی دیکە جیایە، پانتایەکی جیاوازی داگیرکردوە، بوعدێکی دیکەی بە مانا بەخشیوە لە چیرۆکی

(ئنجانه)دا ل ۳۰- ۳۹ که له هەردوو مردنی (دایک و کچ) دیارتره. ئەویش مردنی ئینجانەکەیە یان شکانی ئنجانەکەیە.

مردنی ئنجانەکە لە هەموو مردنەکانی دیکە فەلسەفی ترە.

* نزیکەی تەواوی چیرۆکەکان کە پڕن لە مردن، هەمان شێوەی مردن دووبارە دەکەنەوە بە بێ ئەوەی سیفەتێک یان ڕوئیایەکی نوێ بۆ مردن بێنە گۆڕێ.

ئەو ڕوئیاو بۆچوونەی کە نووسەر لەو سەدان نێوانە جیا دەکاتەوە کە هێندەی بتەوێ چیرۆکی پڕ ڕووداوت بۆ دەگێڕنەوە.

* دەتوانین مردنێکی دیکە دیاری بکەین کە لە گۆشەی مردنی باو چۆتە دەرێ و ئەگەر پەرەی پێ درابا ڕوئیایەکی بۆ چیرۆکنووس دروست دەکرد، ئەویش لە چیرۆکی (زیل. ل۵۹- ٦۲)دا

* دەڵێن ئێستا ئەو ژنە چۆتە پێستی جنوکەوەو شەوانی درەنگ بەم سەحرایانەدا دەگەڕێ.

هەر چەندە لەنگی ڕستەکە بەشێک لە جوانکاریەکەی ون کردوە.

**۲- خەم:**

لە هەر هەموو چیرۆکەکاندا وشە بە شوێن (خەمێک)دا وێڵە، بە دوای ڕاڤەکردنی خەمێکدا دەگەڕێ، بێ ئەودی ئەو خەمە نهێنیەک ئاشکرا بکات. یان بێ ئەوەی ئەو خەمە بازدانێک یان گۆڕانێک دروست کات و زمان و وشە لەو داخراویەی (واتا)یە ڕزگار بکات.

* (خەم وەک دار بەڕوو لە ناخیاندا ڕەگی داکوتابوو (کۆچ ل۹) ئەو ڕستەیەیان ئەو حاڵەتە دەتوانرێ بە هەمان واتاوە دەگەڵ هەموو چیرۆکەکان بەکارببرێ.

* بەڵام هاودەمی گیانیم تەنیا ئازارەکانی ڕۆحمن ئەوان هاو خەم و هاو ناسۆزی منن ل۷۰)

**۳- پایز:**

پایز دەکرێ، پایزی تەمەن، پایزی چیرۆک بێ دەست بردن بۆ پایز، وەگەڕ خستنی پایز بەو درشتیە نە تەمەن کامڵ دەکات ونە چیرۆک.

وەگەڕ خستنی پایز بەو تەرزە سەد ساڵە تەنها هەر لە ئەدەبی ئێمەدا باوەو دەتوانین چەندان نمونەی بالا چ لە چیرۆکداو چ لە شیعردا بهێنینەوە.

گەیشتنی (هێمن) بەو پایە بەرزە لە شیعری لاوانەوەدا یان لەو شیعرە پڕ غوربەتانەی ئەشکی ڕوحی دەگەڵ دەڕژێ، پشکێکی گەورەی پایزیان تێدایە، دوا دەنگدانەوەی پایزیش لە (ژەنەڕاڵی پایز)ی حەمە عومەر عوسمان دایە.

لە چیرۆکیشدا دەریایەک لەو تەرزە باوەی بەکاربردنی پایزمان هەیە. لە ئەدەبی جیهانیشدا ڕەگی ئەو بەکاربردنە لەگەڵ ڕەگە هەرە سەرەتاییەکانی ئەدەبیات تێکەڵە- دەشێ ئێمە نووسەرێک یان شاعیرێک نەبینینەوە کە هەوڵی نەدابێ غوربەتی خۆی وەک ئادەمیەک بە پایز وەرنەکا.

* لێرەش نووسەری بە نرخمان (پایز) لە سادەترین و باوترین تەرزدا وەگەڕ دەخا. بۆ نموونە

* بیری لە خەمی گەڵا ڕێزانی دارستانەکەو گەڵا ڕێزانی خەمی خۆی نەکردۆتەوە. ل٦٤

لە لێکدانەوەیەکی هەرە سادەدا بونیادی ئاشکرای چیرۆکەکە کە لە هەمان کاتدا بونیادی شارەوەشیەتی دێتە سەر ئاو.

خەمی دارستانەکە = خەمی خۆی
دارستانەکە = خۆی
دارستانەکە = خۆی

(خەم و گەڵاڕێزان) جووتە ناوێکن بۆ یەک مەبەست جگە لە لێکدانەوەیەکی زۆر باو چیدیکە لە خۆیان ناگرن. ئیدی وەختێک ڕستە لە توێکڵی ماناکان ڕووت دەکرێنەوە خوێنەر مەبەستی نیە داخۆ (دارستان، خۆی) کامیان دەبێتە (ڕووداو) یان کامیان دەبێتە سەردێڕ.

یان دەڵێ:

- بیـر لە خـۆی و پایز دەکـاتەوە ل٦٤ (دەتوانرێ هەر کـامـێکیـان لابـبرێ) ئەوەش دەلالەتی بەگـەڕخـسـتنی سادەی زمـانەکە ڕایەڵێک لە دوای خۆی جێناهێڵێ.

ئەوە ئەو حاڵەتەیە کە پێی دەگـوترێ کارکردن لە سینتـاکسی زماندا یان ڕێنووسی باو.

* ئەگەر بکرێ بڵێین گەورەترین و فراوانترین بوار کە تا ئێستا کاری داهێـان و خۆ فـەرزکـردنی تێـدا نەگـەیوەتە شوێنی شایان (ئەو بوارەیە نێوی ئەدەبی ئافـرەتیـان لێناوەو منیش مەبەستم ئەو بوارەیە کە لایەنە شاراوەکانی ناخی ئافـرەت وەک مرۆی خاوەن حس و ئارەزوو و ژیان و سەربەخۆیی ئاشکرا دەکات).

بەڵام مـەخابـن نووسەری بەڕێزمـان وەک تەواوی نووسـەرانی ئافـرەت هەتا ئێـسـتـا گـەورەیی و جـوانی و پاکی و زیندوویی هەتا ئابڕووی ئافرەت لە پەیڕەوکـردنی دروستی ئەو ڕێوڕەسمەدا دەبینەوە کە پیاو بۆی کێشاون، لادان یان چ نەبێ خەون دیتن بە ئارەزووە حەقـیـقـیەکانی ژن دامـاڵـینی ژنە لە هەمـوو ئەو ئاکـارە جـوانانـەی سـەرەوە. بەڵام ئێـمـە دەزانین گـەورەیی ئەدەبی ژنان لە ڕووتکردنەوەی ژن دایە لە هەمـوو ئەو سـیمـا خوازراو پڕ شەرم و تەسلیم بوونانەی کۆمەڵگەی پیـاو بۆی ڕەسم کردوون. گەورەترین و پڕ فێـڵـترین ئەو پەیڕەوانە وەفـاداری یەکلایەنەی پڕ ڕیای ئافـرەتە بۆ خۆشەویستی گەندەڵ و دێوجامە ئاسای پیاو، ئەو خۆشەویستیەی کە چ نەبێ لە ڕۆژهەڵات مۆدرێنترین کۆتە،

قەشەنگترین تەڵەیە بۆ خەونە زۆر سادەکانی ژن.

* نووسـەری بەڕێزمـان وەکـو زۆر لە نـووسەرانی ئافـرەت بەوەنده ڕازی بووە کە شێوەیەک لە لێدانی ژن و پشت گوێ خستنی یاداشت بکات و ڕازی بێت بەوەی تەنها پرۆتستی ئەو ڕەوشە بکات.

* * *

لە زۆر جێی دیکە، شتێکمـان بە نێوی وەگەڕخـستنی زمان لە زاری

پەرپوە، بەڵام نە لە دوور نە لە نزیک ئەوەمان مەبەست نیە کە هەندێ برادەری دیکە بە نێوی گرنگی دان بە زمان ڕاڤەی دەکەن، کە زیاتر بەو لایەدا شتەکە لێک دەدەنەوە (کە زمان لە ڕووی ڕێزمانی و شێوەی سفت و بێ گرێییەکەی ئەو ناوچە یان ئەوی دی بەکاربېرێ.)

لە پرۆسەی زمان، یان هەیکەل و ئێستاتیکا شتێکم مەبەستە کە جارێ بواری ڕاڤەکردنی تەسکە. من بە لامەوە وایە کە هەموو شتەکان بە ڕووداو گرێچن و مەعریفەو.. تاد...

هەموو گرنگ و زیندوو و پڕ هونەرن بەڵام ئەوانە هەر هەموو لەبەردەم کاتدا شتی پڕوپوچن و چۆک دادەدەن، ئەوانە ئەو وەختە گرنگ بوون کە بەشێک لە گرنگی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری و هەواڵ کەوتبووە سەر شانی چیرۆک، ئەورۆ چیرۆکی هەواڵ ئامێز، چیرۆکی پڕ ڕووداو گرێچن هەر کەسێک بگری تێیدا وەستایەو هەست و شعووری گوێگر هەڵدەتەکێنێ.

ئەوەی کات ناتوانێ تێکی بشکێنێ، ئەوەی کات زیندوو ڕادەگرێ زمانە.

زمان وەک فەلسەفەو ڕووداو و گرێچن و مەعریفە، زمان وەک ڕابردوو سبەینێ. دەکرێ سیحرێک و پەرچووەک لەهەر وشەیەک، لەهەر دەربڕینێک و لەفزێک دروست بکرێ، یان وەخەبەر بهێنرێ. خەڵکی داهێنانیان زۆر ڕەنیو هێناوە، ڕێیان زۆر بۆ خۆش کردووین، دەشێ ئێمەش ببینە خاوەن داهێنانێک لە زماندا، تەقینەوەک لە وشەدا، لەو زمانەی تاکە بنەمای بێنەزیری بووغانە.

* لێرەدا بەهیچ جۆرێک مەبەستم چیرۆکە ناسکەکانی (خەمەکانی پاییز) نیە جگە لەو شوێنانەی ڕاستەوخۆ نموونەم لێهێناونەوە.

* لە کۆتاییدا دەشێ چیرۆکەکان عاقڵانە بن و ئێمە خوێندنەوەیەکی عاقڵانەمان بۆ نەبووبن و ببوورن.

# وێنەکەی خوشکت

* «وێنەکـــەی خـــوشکت» دوا بەرهەمی چیـــرۆکنووس (ڕەووف حەسەن)ە، سەرەڕای پێشەکییەک، دوازدە چیرۆکی گرتۆتە خۆی، ئەوە جگە لە پێنج پۆستەرە چیرۆک لە ژێر سەرناوی (خۆشەویستی بەڵام).
* سەرەتا پێشەکییەکە بەهەمان سۆزو زمانی چیرۆکەکان نووسراوە، یان دەشێ ئەو پێشەکییە وەک چیرۆکێکی سەربەخۆ تەماشا بکرێ و هیچی لە چیرۆکەکان کەمتر نییە. هەمان تەکنیک و زمانی تێدا بەگـەڕخـراوە، بەڵام چونکە چیـرۆکنووس بەو دیدەوە نەهاتۆتە پێش، ئێمەش وەک پێشەکییەکی ئاسایی، بەڵام پڕ سۆزو ئەندێشە و هەندێ ڕاستیی ژیانی نووسەر وەری دەگرین و هاوخەم و هاوسۆزی دەبین.

* * *

* ئاسۆ: ئاسۆی ناونیشان و ئاسۆی تەمەن و ئاسۆی هومێد یان ڕووخانی بنەماکان و نەمانی هۆکارە سەرەکییەکانی بە پێوەوەستانی ئاسۆو هومێد و مانەوەی ئاسۆ.

ناماناوێ لە زنجیرەکانی ڕووداو بدوێین، دیسان نامانەوێ لەو بەرپرسیارییەتە گەورەیە بدوێین کە خراوەتە ئەستۆی چیرۆک، کە دەبینین کراوەتە چەکی مانەوەو چەکی شۆڕش و چەکی بارکراوی فیکر. تەنیا سەرنج دەدەینە ئەو بیرو فیکرە نەوتراوو نامۆیە، ئەویش مانەوەو لەسەرپێ وەستانی «ئاسۆ»یە وەک هومێدی دوا مەنزڵ لەوەختێکدا

ئەوانەی ئاسۆیان بەدیاری هێناوە مردوون، ئەوانەی لەودیو ئاسۆوە دێن و ئاسۆیان هەڵکردووە نەماون و لەدەست چوون. دەشێ ئەوەش لەو راستییە نزیکمان بکاتەوە «لە نائاگایی نووسەردا» کە هەوڵ و شۆڕشەکان «ئەدات و وەسیلەیەک نین بۆ گەیشتن بە ئامانجێک»، بەڵکو بۆ خۆیان ئامانجن. ئیدی ئەوانەی لەودیو تەلبەندەکانەوە بەو هومێدەن ئەوانە وەسیلەیەک بن و هومێد و ئاسۆی ئەوان نزیک بکەنەوە هەڵەن یان ئەو ئاسۆیانە تاکە وەهمی خۆش و گەرمی ئەودیو تەنبەندەکانن، ئەگەر نەڵێین تاکە ئامانجی بەدەستهاتووی ئەو دیو تەلبەندەکان ودواثاواتیان تەنیا ئەو وەهمەیە. کە وجوودی نییە.

* پێت نەگوتم تۆ کێیت! جوانترین شێوەی گێڕانەوەیە لەو کۆمەڵەدا، گێڕانەوەی یادگار، نووسەر بەسەر بەخۆیی تەواو و ئامادەییەکی پتەوەوە دەست بە چیرۆکەکە دەکات و تا دوا پلە سەربەخۆییەکەی دەپارێزێ.

(فەرموون خاتوونەکەم! بەئارەزووی خۆت سەیری ئەم دووچاوانەم بکە.... بزانە هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ هی گەماڵەکەدا هەیە!؟) ل ۳۰، بەڵام ئێمە ناتوانین ئەوە بشارینەوە کە گەرموگوڕیی چیرۆکەکە لە نهێنییەکە دایە، هێشتنەوەی سەرناوی چیرۆکەکە «پێت نەگوتم تۆ کێیت» هەیکەلی چیرۆکەکەی دەخستە دنیای سیحروتەمەوە، وەک ئەفسوون دەمایەوە، لەگەڵ کاڵبوونەوەو نەمانی ئەو نهێنییە توانای چیرۆکەکەش کاڵ دەبێتەوە، هەرچەندە زمانی دەربڕین خانەکانی سۆزو ئەندێشەی پڕکردۆتەوە، بەڵام گۆرانییەکەی کۆتایی و شادمانییەکەی هەمووان خەمی مردنی چیرۆکەکە و مردنی نهێنییەکەیە. هەستی سادە و کۆتایی هێندێ چیرۆکی هەرزەکارانەی باو، خەیاڵی جوانی نووسەری فریو داوە، دەنا بونیادی سەرەتاو کاکڵی چیرۆکەکە لە بەهای کات یان زەمەندایە کە هەرگیز ناگاتە شادی.

(هەموو بەسۆزو سەرسامییەوە بۆ ئەو دوو دڵدارە دەڕوانن.. دەڕوانن چۆن خاتوون هەردوو دەستی کاسکێتبە سەری توند بە سنگییەوە

نوساندووەو ... خورِ خورِ فرمێسکی شادمانی دەرِێژێت) ل ٣٨.

* ئەو لاپەرِانەی مێژوو لە ئەدەب و نووسیندا دەدرەوشێنەوە... ئەو یادگارانەی مرۆن کە هەرگیز نایەنەدی و جوانیشیان لەو نەهاتنە دییەی دایە.

*  *  *

* تەوالێت: زمانێکی پەخشانی سفتوسۆلّ ئەندێشە و خەیالّ و سۆزی «برزوو»یەک دەگێرِێتەوە. لەبەرئەوەی ئەو تەرزە نووسینە تا دوا هێلّ راوی تێدا کراوە، ئەو کەسیەتە لانەوازو رووتە هێندە بە خەلّکی ئاشنایە و بواری داهێنانی تێدا تەسکە.

* وێنەکەی خوشکت: جوان نووسین لەرێکەوت و رووداو دا، جوان نووسین لە چیرۆکی نەخشە بۆ رێژراودا ئەوەندەی دەکرێ هاتۆتەدی. لێرە چیرۆک بۆتە فەلسەفەی رەوشت و رەوشتی فەلسەفە. چیرۆکنووس وەک خاوەن بیرو هۆشمەندێک، وەختێک دەبینێ هەمووکایەکانی دی بۆتێگەیاندنی عەقلّیەتی رۆژهەلاّت، یان تێگەیشتن لەگەلّ ئەو عەقلّیەتە بێ ئاکامە، دوا هەولّی خۆی لە رێگای تەکنیک و زمانی سۆزو نهێنیی چیرۆک تا دوا پلە وەگەرِ دەخا. خۆی لە هەموو بوارێک نزیک دەکاتەوەو تا گالّتە بەتەرازووەکانی رەوشت دەکات و هەولّ دەدات ئەو نەفسە خوودار و بیرو دەمارگیرییە بێ بنەماو فریودەرەی رۆژهەلاّت تێکشکێنێ و بەهۆش و بە ئاگاییەوە جوانترین تێکەلّبوون لەشەرمەزاری و دوو زللە و دوو رەوشتی نابەرانبەر و کاریگەر بخولّقێنێ. ئەو زللانە، ئەو دەرسە «ناخی» هەموو جوامێرێکی رۆژهەلاّت دەتەزێنێ و لە پۆخلاّواتی خۆسەپاندن و تۆق و بەند و کەلەپچەکانی خۆشەویستی بەئاگادێنێ.

* (ئەلبێرت وێنەکەی هەر نەداییەوە دەستت... لە گۆمی چاوە سەوزەکانی «سروە»ی خوشکتدا نقوم بوو بوو.... وێنەکەی نا بە لێوییەوەو لەبەرچاوی خۆت ماچیکرد....... ئەمجا تا هێزت تێدا بوو زللەییێکی وات تێسرەواند)... ل٥١.

+ ئەوە كرۆك و مەتەڵی چیرۆكەكەیە، ئەوە لەراست یەك راهێنانی دوو شارستانیەتە، لە واتاكانی «ئەخلاقدا»، چونكە چیرۆك لێرە بۆتە راڤەكردنی خانەكانی رووداو و ماناو رەوشت ئێمەش ناتوانین لەو خانەو ئیرشادانە دەرچین، چونكە ئەوانە خانەی تەمەنن.

* (ناتوانیت بۆن و بەرامەی كچێتی لیللیت هەڵمژی... بەسەری چوار پەنجە زللەیێكیان تێسرەواندیت..... ئەلبێرت دەستی خستە سەرشانت و.... تەنها مەبەستم ئەوەبوو بزانیت لیللی خوشكی منە..).ل٥٥

* تەوقەی خۆشەویستی: بەو چیرۆكە جێگای خۆی لە چیرۆكی خەیاڵی زانستی پتەوتر دەكات، پانتاییەكی باشی لە رووبەری چیرۆكی خۆی داوەتە ئەو تەرزە چیرۆكەو بە حوكمی بواری پسپۆری و كاركردنی، تێشیدا سەركەوتووە.

* ئێمەش وەك خوێنەر هەست بەپێشكەوتنی زانست و دەلالەتە مەعریفییەكانی مرۆڤ دەكەین دوای نزیكەی «٢٥٠»ساڵی دیكە وەك چیرۆكنووس وەسفی دەكات، لە توانای مرۆ بۆ گەشە پێدانی خانەكانی مێشك یان توانای زانست لە كاركردنی لەناو پێكهاتەكانی جەستەی مرۆ. ئێمە وەك خوێنەر دەكەوینە ئەو بارە پێشكەوتووەی كە چیرۆكنووس دەیخوڵقێنێ. ئێمەش دەشێ بپرسین- ئەو دەم- زمان و گفتوگۆ هەروەك ئێستا دەبێت، دوای ئەو پێشكەوتنە خولیاكانی كەس هەر وەك ئێستا دەبێت. توورەیی و دەمارگیری هەروا دەبێت؟.

(كار وابروا كارێكی شێتانە دەكەم و دەیقەومێنم) ل١٠٤

دەبێ دیاردەكانی -رق- توورەیی- شێتانە- هاوار- قیژاندن- هەمان دەلالەت و مەبەستی ئێستا بگەیەنن.؟ یان خۆشەویستی، ژن هێنان، لەشی ئەفرەت، لەزەت، هەرهەمان شتی ئێستا بن؟.

* مەبەستمان لێرەدا ئەوەیە لە چیرۆكی خەیاڵی زانستیدا، كاركردن تەنیا لەسەر بیرۆكەیەك ناكرێ بەڵكو زمان و بیروبۆچوون و پێوەندییە كۆمەلایەتییەكان هەموویان دیدوبۆچوونی پێشكەوتوویان دەوێ

بەرادەیەک لە ئاستی خەیاڵە زانستییەکە داین.
(مامۆستا ڕەووف ئەگەر بکرێ بڵێین بۆتە یەخسیری ئازاری گەلەکەی، بێ ئاگاداری و پێشەکی ئەو خەمەی بۆ مرۆڤانی ئەو کاتەش کردۆتە دیاری.
(تا ئەو دڕندانەی کاتی خۆی ئەم تاوانانەیان کردووەو بەسزا نەگەیشتوون... زیندوویان بکەینەوەو سزایانبدەین؟!) ل١٠٤
* یان (خەمێکی نازدار لەروخسارێدا دەدرەوشێتەوە،...... تێکەڵاوی جینەکانی بووە). ل١٠٩
+ ئەرێ دەبێ لەوێش هەر تاوانبارەکان زیندوو کرێنەوە؟ خۆزگەمان بەخۆیان.. ئەگەر بۆ سزاش بێ.
+ ئێمەی کورد شتێکی دیکەمان نییە بۆ نەوەکانی دادێ، تەنیا کەسەرو خەم نەبێت کە هەیبەت و سەنگینی ونهێنییەک بە رووخسارێان ببەخشێ، گوایە ئەوانە جێی شانازین بۆ «٢٥٠»ساڵی دادێ.
لە کۆتاییدا دەڵێم:
١- من نابێ ئەوە لەبیر بکەم کە لەگەڵ چیرۆکنووسێک مامەڵە دەکەین هەڵگری فیکرو فەلسەفەو بۆچوونی خۆیەتی (لەنێو چیرۆکەکانیشدا) ئەو فیکرو فەلسەفەیەی سەدەیەکی خستە گومانەوەو خۆشی ماندوو بەقەناعەت و فەلسەفەی خۆی دەربارەی نەتەوەو جیهان و چینایەتی دەنووسێ.
٢- تەکنیک و زمان و میکانیکییەتێکی تایبەت بەخۆی هەر لە ئەزەلەوە تێکەڵی بووەو ئێمەش خانەی داهێنانەکانی هەر لەو بوارەوە تەماشا دەکەین.
٣- دەشێ بڵێین کاک ڕەوف و هاوڕێکانی دوا ئەزموون و دوا شێوازی داهێنانی خۆیان دەنووسنەوە ئەوەش ڕاسپاردەیەکی دیکەیە کەوتۆتە سەر شانیان.

# کەمتیار

کەمتیار یەکەم نۆڤلێتی چاپکراوی برای نووسەر (کەریم دەشتی)یە، کە دوای عومرێک لە بەرەڵاکردنی چوێلەکەکانی شیعر و نووسینەوەی «خاک» و گرتنی «تەم» وپێداچوونەوەی «وردەگەڵا»، دوای عومرێک لە خۆشنوودییەکانی مۆسیقا، کەمتیار وێڵی مێرگە بریندارەکانی رۆح دەکا.

* پێشتر دەبێ ئەوە بڵێین، ئالییەت و میکانیزم و کەرەسەی سەرەکی چیرۆک و شیعر زمانە، بارانی دارستانەکانی شیعرو چیرۆک زمانە، بەبێ زمان نەشیعرێک دەلەرێتەوەو نەچیرۆکێک دەپشکوێ ئەو دنیایەی ئەو دوو باڵندە، ئەو دوو هەناسەیە دەیانەوێ بیگەنێ، نێو هەورەکانی سەمفۆنیاو هاوارگەکانی نەمرییە.

* گەلگامێش بە شیعر ئەنکیدۆ دەلاوێنێتەوە، چیرۆکەکانی خواکانی یۆنان هەموو شیعرن، ئەو شیعرانەی لە لێوەکانی زمان پژاون.

* بە نێو ئەو دوو دنیایەدا دەچینە نێو هەناسە حەرامەکانی کەمتیارەوە

* * *

کەمتیار لە دەپاژ پێک دێت و دەشێ هەر بەشەو وەک چیرۆکی سەربەخۆ بەتەنێ وەخوێنرێ. هەر یەکەو ماناو زمان و سەبکی تەواوی خۆی هەیە لە بارێکی دیکەش بە هەر هەمووان هەیکەلی مامەندو شێوە

گشتیی کەمتیار تەواو دەکەن.

* لە دەلاقەکانی سەرەتاوە، یان راستر لە یەکەم مەنەلۆگدا، مامەند نیشانەکانی جەستەی خۆی و ئالقەکانی زەمەن و گوناحەکانی رۆح دەوردەکاتەوە: «وەبیر خۆت بێنەوە، منداڵەکان کە دەیانقیژاند، خەنجەرەکە، کە لەبەر تریفەی مانگدا وەکو گڕی تەنوور دەبریسکایەوەو خوێنی لێ دەچۆڕا، ئەو پیاوەی لە خەوی شیریندا بوو، ئەو خوێنەی تێکەڵ بالینگانی ژن و مێردایەتی ببوو، مامەند وەبیر خۆت بێنەوە، ئەو خوێنەت لە پای چی رژاند...؟».

* بەو باوەڕەی کە زمان لە نائاگایی نووسەردا پشکۆ گەشەکانی ماناو خانە لە پێشەکانی مەبەست دادەڕێژی، بەو باوەڕە لە دەرگا دەدەین.

## وەبیر خۆت بێنەوە

وەک یەکەیەکی زمان دەلالەت لە وەبیر هێنانەوەی «شتە نووستوو، یان ونبووەکان دەکات، وەک یەکەیەکی واتا وشەی «بیر» لە دیدی خوێنەردا دەخاتە سەرپێ، دەنا مامەند چ کاری بە وەبیر هێنانەوە نییە! ئەو لەو بیرکردنەوانە هەڵدێ، ئەو بیرکردنەوانەی تەمەنیان گەمارۆداوە.

* قیژەی منداڵەکان و خوێنی خەنجەرەکەو ئەو پیاوەی لە خەودا کوشتی و.... تێکەڵ جەستەی بوون و داغان داغانیان کردووە، ئەوانە ئەفسانەنین و ماکی ئەو خوێنانەن کە جەستەیان رەش کردووە. ئەوەش لە کاتێکدا کە «دەروون» لەو پەڕی هۆشیاریدایە، بێهوودە هەوڵی خاوێنکردنەوەی رۆح دەدات. بێهوودە هەوڵی پاکبوونەوەی رۆح دەدات، بێهوودە بە پەیژەکانی خاوێنبوونەوەدا هەڵدەزنێ و بۆ ئەوەش لە سزادانی و ئازاردانی گیان و دەروون کەڵک وەردەگرێ.

* هەر لەسەردەمی گریکەکان ویۆنانەکاندا سزادان و ئازاردانی جەستە یەکەمین هەنگاوی «پاکبوونەوەی گیان و دەروون بووە ئەوەش بەرزترین پلەی پاکبوونەوەیە ئەگەر بگاتە لووتکە.

وەختێک ئۆدیب پاشا بەهۆی سەرسەختی کریۆن-ەوە دەزانێ دایکی منداڵەکانی و لە هەمان کاتدا دایکی خۆیەتی، لۆمەی جەستەی دەکات و دەڵێ چۆنی نەزانیوە؟ دەبوو لەو دەمەدا ئاگری گرتبا، هەر بۆیەش ئەو تاوانەی جەستەکردوویەتی هەر جەستەش دەبێ سزاکەی بدات، بۆیە یەکجێ هەر دووچاوەکانی خۆی هەڵدەکۆڵێ. ئەوە فەلسەفەی مرۆیە، ئەوە فەلسەفەی ئەو دیوی- تایە بێ ئامانەکان-ی کەمتیارە.

* پرسیار لێرەدا ئەوەیە ئەو پرۆسەیە تا چەند ئەو مەرامە دەپێکی؟ ئایا تەنیا جەستە ئەو ئاگرانە دەکاتەوە؟ بنەڕەتی ئەو فەلسەفەیە لەوەوە هاتووە کە جەستە گوڵی نەمانە، رۆح با بەرزبێت و جەستە لە بەین بچێ.

* «جەستەو هەستم تەواو لەیەک دا برابوون، جەستەم مردبوو،... بەڵام زیندوو مانەوەی هەستم تەنها لە سۆنگەی ئەوە بوو لە ئازارێکی ئەزەلیدا بژیم» ل٦٨ کەمتیار.

* ئەوەی لێـــــرەدا دیارەو مـــــەودایەکی بۆ لێکدانەوەی دووەم نەهێشتۆتەوە ئەوەیەکە «مامەند» مەیدانی ئەو رمبازییە، بۆ خۆی لەوە بە ئاگایە کە حاڵەتەکانی نا ئاسایین و بۆ خۆی بە تەواوی هۆشییەوە دەچێتە نێو ئەفسانەکان:

«ئەو ئێوارەیە تەواو لە دنیای جارانم ترازام» ل٢٠

«هەر چەند سەیری خۆم دەکرد ئیدی فرم بەسەر مرۆڤەوە نەمابوو» ل٦٨

## ئەو ئەفسانانەی کراونەتە واقیع

«بە پەلە هەستامەوە، سەیری گەردنی خاتوونم کرد، جێی هەڵمژین و گازەکانی تەبەش سووتاو وەکو خەناوکەیەکی سوور دەبریقانەوە» ل١٨ کەمتیار.

* * *

* ئێمە لەوە دڵنیاین نەک تەنیا چیرۆک و رۆمان هەموو بەشەکانی دیکەی نووسین و شێوەکاری و مۆسیقا جۆرێکن لە دایەلۆگی

راستەوخۆ، جۆرێکن لە گوتن و گوفتار، هەر چەند لێرەدا «دایەلۆگ» وەک هونەر پانتاییەکی باشی دراوەتێ، بەڵام هەر هەموو نووسینەکە لە شێوەی دایەلۆگێکی بەردەوام نووسراوە.

«دەروونم... ببوو بە مەیدانی تەراتێنی هەموو ئەوانەی کە بەر لە سی ساڵ مامەڵەی نهێنیم لەگەڵیان دا کردووە» ل٤٦

* * *

* لە کۆتاییدا خوێنەر ئەو راستییەی زیاتر بۆ دەسەلمێ، کە «لە نێوان شەڕی کەمتیار و گورگدا تەنها مرۆ زەرەرمەندە».

# چەند وردە یادێکی مەییو

«چەند وردەیادێکی مەییو» یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی برای نووسەر (عەبدوڵڵا خدر مەولوود)ە، چواردە چیرۆکی تێدایە، بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز بڵاویکردۆتەوە.

لێرەدا نامانەوێ بەسەر کات یان مێژووی نووسینیاندا بچینەوە، چونکە یەک ئاستی و یەک مەودایی چیرۆکەکان بایەخی کاتی سڕیوەتەوە. هەموو چیرۆکەکان دەچنەخانەی گێڕانەوەی یەک دیو یان ئەو حاڵەت و باسانەی کە شوێنێکیان لە هەست و ئەندێشەی نووسەر داگیر کردووە.

## رووداو

گوێزانەوەی رووداو، تەنیا وەک (حەدەس) یان دەربڕینی باری چەوسانەوەی کەسێک وەک نموونەی میللەتێک، بەڵام دیسان وەک ڕاگەیاندن، ئەورۆ هەر ڕاپۆرتێکی ڕۆژانە ئەو ئەرکە مەیسەر دەکات و چیرۆک لەو سەرقاڵییە ئازاد دەکات.

(ئەفەندییەکەی بەرانبەری تا هێزی تێدا بوو شەقازللەیەکی لێدا، ئاگری لە چاوان بڵندکرد). ل(٢١).

(حوسێن لە ژوورەکە هاتە دەرەوەو بۆ لای حەمامەکە چوو). ل(٣٧)

(پاش ماوەیەکی زۆرکەم دیتم جەمۆ هاتەوە، دەرگای قەمەرەکەی

کردەوەو سوار بوو). ل(٣٣)

## تەکنیک

جگە لەوەی کــە ئەورۆ «زاڵـی ڕووداو» یان «دەســەڵاتی ڕووداو» گــرنگی و بەهای خــۆی لە دەست داوە، جگە لەوەی کــە بۆچوون و بنەماکانی دەسەڵاتی ڕووداو لە چیرۆکدا تێکشکاوە، جگە لەوانە لەو کۆمەڵە چیرۆکە «ڕووداو» زیندانی زەمەنی ڕووت یان کات و وەختی ژمــێــردراوە. واتە کــات یان «وەخــتی ئاســایی» ڕووداوەکــان «چیــرۆکــەکــەیان» کــۆنتــرۆڵ کــردووە، واتە ڕووداو بەپێی زەمــەن گێڕاوەتەوەو هونەری «تەکنیک» شوێنێکی لە پانتایی چیرۆکەکاندا نییە، واتە نووسەر خۆی لە بنەما یان واتا هەرە سادەکانی تەکنیکی ئەورۆ نا، تەکنیکی باوی هەشتاکان و پێشتریش بێبەش کردووە، بەو هیوایەی کە «فیکرو بیری زاڵ و گێڕانەوە» جێگای هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە.

(هەفـتـەی یەکـەم هەندەیان لێ دابوو.. هەندەیان لێ دابوو بەزمـان ناگێڕدرێتەوە). (٢٣)

(هەفتەی دووەم تا دەهات لێدان و ئازاردان هەر لە زیادە دابوو...). ل(٢٤)

(هەفـتـەی یەکـەم و دووەم پیرەدایک لەلایێ خزم و دۆستی نزیکی لەلایەکی تر...).(٢٥)

ئێـمــە نامـانەوێ نموونە لە چیـرۆکـەکـانی دیکەش وەرگـرین، بەڵام دەڵێین:

ئەو گێـڕانەوەی کـە زەمـەنی سادەو یەک دیو، کـە کـاتی ڕۆژژمـێـر و هەست پێکراو دەســەڵاتی تەواوی بەســەر ڕووداو و فــەزاو زمــانی چیرۆکدا هەبێ، ئەوە هیچ بیانوویەک نامێنێ بۆ هەبوون یان وجوودی تەکنیک. لێـرەدا مـەبەسـتم تەنیا ئەو چەند چیرۆکـە نیـیـە، بەڵکو ئاماژەیەکە بۆ هەمـوو ئەو چیرۆکانەی کە زەمەنیان وەک کاتی ڕوودان و

حاڵەتی سەپێنراو تەماشا کردووە.

## زمان

نووسەر وەک بەشی زۆری نووسەران، سیحرو ئالیەتی زمان و نهێنییە نەبڕاوەکانی ناخاتە خزمەت بونیادی گشتی چیرۆک و ئەو دنیا سەرکێش و پڕ هەیبەت و ئالۆزەی زمان دەکاتە ئەداتێکی بچووک و سادەو بێکاری دەربڕین، واتە زمان لەگەیاندنی چۆنیەتی ڕووداوبترازێ، چ کارێکی دیکە نییە، واتە زمان جگە لە گواستنەوەی هەست و نەستی مرۆی ناتەواو بترازێ، واتە زمان جگە لە گوزارە لەو حاڵەت و نەفسیەت و فەزا یەک دیوانەی مرۆی ناکامڵ بترازێ کارێکی دیکەی نییە.

باشترە ئەوەمان لەبەرچاوبێ کە ڕووداو و تەکنیک و فیکرو بۆچوون زەمەن پیریان دەکات و دەیانسڕێتەوە، ئەو ڕووداوەی ئەوڕۆ دنیا دەهەژێنێ، ئەو بیروباوەڕانەی ئەوڕۆ برەویانەو چیرۆکنووس یان شاعیر و نووسەر بونیادی نووسین و بەرهەمەکانی خۆیانیان لەسەر هەڵدەنێن، دەشێ سبەینێ هیچ و بێ بایەخ بن، ئەوەی دەمێنێتەوە، ئەوەی گیانی نووسەرو کیانی گەل هەڵدەگرێ و دەپارێزێ و کۆن نابێ و زیندووە هەیکەلی گشتی و بونیاد و دینامیکیەتی زمانە.

نووسەر هەموو دەرگاو پەنجەرەکانی ئەو دنیاو حاڵەتانەی ڕۆی ناون، خستونیەتە سەرپشت و دەروازەیەک نەماوە بیکوتین و شتێک نەماوە تێی بگەین، چونکە نووسەر بە تێگەیشتنێکی تەواوەوە هەموو شتەکانمان پێڕادەگەیەنێ.

## کۆتایی

نووسەر توانیویەتی لەوەسفی وردو جوان و وێنە ڕوون و کاریگەرەکانیدا شتێک لە یادەمەییوەکانی، بەشێک لە بیری نەتەوەیی خۆی بخاتەڕوو، وەک بەڕێز «محەمەد خدر مەولوود» لە

پێشەکییەکەیدا دەڵێ:

«خاسیەتێکی دیکەی چیرۆکەکانی ئەم کۆچیرۆکە وەسفکردنی وردی حاڵەتەکانی بە «شوێن و ڕووداو و کەسانەوە»... ئەوەشیان لایەنێکی دیکەی سەرکەوتنی هونەری چیرۆکنووسە.»

# سڵاو: سوڵتانی دیل

ئەوەی بەنێـــو «ئەدەبی ژنان یان ئافـــرەتان» نـاو دەبرێ، ئەگـــەر بنەمـایەکی هەبێ، هەڵبەت ئەوە نییە کە دەبێ «ژنان» نووسەری بن، بەڵام نەبوون یان کەمی ئەو بەرهەمانەی دەچنە نێو ئەو ریزەوە لە نێومە بواری ئەوەی رەخساندووە پەنا بۆ هەموو ئەو بەرهەمانە بەرین ئافرەت دەیاننوسێ. بەو پێیـە دەبێ ناسـینەوەی ئەو دەقـانە پابەندی هەندێ سیفاتی دیاری کراوبن. گرنگترینی ئەو سیفاتانە ئەوەیە کە تا چەند حەزو لەزەت و پیرۆزی مێیـایەتی دەردەبڕێ و تا چەند بەیداخی شەرم دەشکێنێ، کە مێیـایەتی کە ماسـیـیەک یان سووکییـەک نییـە بە پێچەوانەوە سولتانی دیلە.

*

دەشێ چیرۆک باشترین و رەوانترین کێڵگە بێ بۆ وەشاندن و گەشە کردنی تۆوی مەملەکەتی هەستەکانی مێ. هەر بۆ نموونە لە نێو ئێمەدا، تەنیـا نووسینەوەی هەستـە شاراوەو حەزە پڕ شەرمەکان و خەونەکانی تەنیـایی هەر مێیەک جوانترین و سەنجراکێشترین بابەتە بەبێ خستنە سەری باری سەرنجی وردو لێکدانەوەی فکری کەسی. نووسینەوەی ئەو حەزە پڕ شەرم و شاراوانە ئەگەر هیچی نەوێ، نابێ لە شتێکی کەم بێ ئەویش بوێرییە. ئەو بوێرییەی کە نێرەکان بە هەمـوو دەسەڵاتەکانیانەوە نییــانە. با هەرگــیـز مێ بەنیـازی ئەوە نەبێ، نێـر بەبراو باوک و

میردو.... هەموویانەوە هەروا ئاسان واز لەو دەسەڵاتە پڕ لەزەتەی خۆی بەسەر هیچ نا بەسەر «تۆی مێیدا» بێنێ و خەونەکانی مێ بنووسێتەوە، بۆ هەموو ئەو بابەتانەی «نێریش» بۆ دنیای ژنانیان نووسیوە وەڵامێک هەیە.

*　　*　　*

بەو نیازە دەچینە نێو دنیای ئەو هەشت چیرۆکەوە:

١- من لە نێوانی من و خۆمدا- مەهاباد قەرەداغی
٢- بە شوێن پێیەکانی دایکمدا- فەوزیە سوڵتان بەگی
٣- خەمی نایەکسانی- رووپاک خۆشناو
٤- خوازەڵۆک - گەلاوێژ ناسیح مەجید
٥- خەونە پڕ شێوەکانی (کانی) با - زیەنەب یوسفی
٦- سبەینێ پێت دەڵێم - سارا ئەفراسیاب
٧- بە زیندوویەتی بەرەو گۆڕستانیان بردم - خەندە گۆران
٨- کۆت و زنجیر - کۆچەر نووری عەبدوڵڵا

دەکرا بەدوای رایەڵە سەرەکییەکانی فکری مێ کەوین لە نێوان هەر هەشتیاندا، بەبارێکی دیکەشدا لێ دوان لەیەکە یەکەی چیرۆکەکان لەو حاڵەتەمان نزیک دەکاتەوە.

## من لە نێوانی من و خۆمدا

هەرچەندە کەسی یەکەم لێرەدا پیاوەو بۆچوونە لێک جیاکانی ناخی خۆی وەک کەسییەتی سەربەخۆو خاوەن شوێن و دەسەڵات نێو دەبات، ئەوەش دەمانباتەوە سەر ئەو بۆچوونە سادەی لە ناخی هەموو کەسدایە، دوو هێزی جیا «شەڕو خێر» بۆیەش ئەوەمان درکاند، چونکە کەسە بەنێو چاکەکە لەو چیرۆکەدا هەمیشە لە ژێرەوەیە، بیروڕایەکانی تەنیا خەیاڵن و نایەنە نێو دنیای واقیع. کەسەکەی دیکە، زاڵەو قسەو حەزی خۆی دەباتە سەر، هەر ئەو دەنگەش یان کەسەش سیفاتی پیاوانەی «کەسی یەکەمی چیرۆکەکە» دیاری دەکات، لە رووت

کردنەوەی دایکی و نووستنی لەگەڵ سۆزانییەک و ئاوێنە شکاندن و تەڵاق دانی ژنەکەی. ئەوانە هەڵوێستی سادەو ئاسایی پیاون و ئەو دەنگە نزمەی کە هەرگیز گوێی لێ ناگیرێ ئەوە ئەو هێزەیە رۆژێک لە رۆژان نێوی خێریان لێناوە.

نووسەر توانیویەتی بە وردەکاری و تەکنیکێکی جوان و شایانەوە وەک مێیەک بەناخی پیاودا شۆڕ بێتەوەو وەک مێیەکی وردو کزۆڵە لەو ناخی قورس و رەشەوە، سەرەداوە گەندەڵەکانی کەسیەتی و دەسەڵاتی پیاو هەڵدەداتەوەو هەیبەتی پڕشکۆ و گرانی پیاو لە ناخەوە هەڵتەکێنێ و ئارەزووە سەر شێتەکانی سەرئاو خا.

لەبەر کورتی زمان نەمانتوانی لێکدانەوەیەکی جیا بۆ زمان لەسەر ئەو چیرۆکە بکەین، بەڵام کە بەرایەڵەکانی تەنیا «موفرەدات»دا دەڕۆین هەست بە دەسەڵاتی زمانی پیاو دەکەین و بەس، ئەو موفرەدانەی کە بێ ویستی - ژن دنیای مێی داگیر کردووە. ئەو هەستانەی پیاو خاوەنیەتی و بەسەر ژنیدا بڕیوە، ئەو جووڵەو توندو تیژییەی بوونە مۆرکی پیاو.

* ئەو چیرۆکە هەواڵدانێکی دیکەیە بۆ رسوا کردنی دەسەڵاتی بێ نەزیری پیاو یان ئەو کۆمەڵگەیەی نێویان لێناوە «باوک سالاری.»

* لەگەڵ سەرکەوتنی نووسەر لە تەکنیک و حاڵەتە وردەکارییەکاندا لەوەسف کردنی دەسەڵاتی پیاو... دەگەڵ ئەوانەشدا، پیاو ئەو جەستەیە بەئیخۆی دەزانێ و ئەوانی دیکە بە «دەمامک» نازانێ و بە مافی خۆی تێدەگا و ئەو ژنە، کە نەڵێم نووسەر دەیەوێ بۆ «وجوودی» خۆی جێگایەک لەناخی پیاودا بکاتەوە.

## بەشوێن پێیەکانی دایکمدا - خەمی نایەکسانی

ئەو دوو چیرۆکە دەگەڵ -تەنگیی مەیدانیان - دەگەڵ جیاوازی بابەتیان هەردووکیان دەچنە نێو رەخنەگرتن لەدەسەڵاتی پیاو.

* بابیشم دەڵێ- «چۆن دەیانڕوخێنم، ئەوە میراتی باوک و

باپیرانمه» ، بەڵام دەنگی ئافرەت بەبڵندی دەڵێ
* «ئەم دیوارانە بڕووخێنە.» «بەشوێن پێیەکانی دایکمدا» لێرەدا مانەوەی ئەو دوو ڕێیە جیایە بێ ئەنجام درێژەی هەیە، «ڕێی پیاو، ڕێی ژن» ئەوەتا «باوک» پاراستنی دیوارەکان بە نەوەکان دەسپێرێ و ئەویش وەک کچێکی ترساو بۆ باوەشی دایکی و دایکیشی بۆ باوەشی نەنکی دەگەڕێتەوە.

*

* لە خەمی نایەکسانییدا، هەیکەلی ئەو چیرۆکە شوێنێکی بۆ قسە تێدانییە تەنیا دەتوانین بڵێین ئەویش داواکەیان هاوارێکە بەڕووی دەسەڵاتی نێردا.
* هەردووک چیرۆک تەنیا لە نێو نیشانەکەیانەوە، ناوەرۆکی سەرەکی و مەبەستی خۆیان واڵادەکەن، هەموو ڕستەکانی دیکە وەسفی ناونیشانەکانە. بەر تەنگی لە بەگەڕخستنی زماندا، یەک دیوی بابەت بواری قەڵەمی ئێمەشی تەسک دەکاتەوە.

## خوازەڵۆک

یەکێکە لەو چیرۆکانەی کە بەدوای کێشەکانی ئافرەتدا ناگەڕێ و لە خەمی تەنیایی و وەڕسی و جووت بوون و پێکەوە ژیانەوە دەچێتە نێو دنیای چیرۆکەکە، لە گێڕانەوەیەکی ئاساییدا ئەستوونەکانی چیرۆکەکە قیت دەکاتەوە. نووسەر لەو چیرۆکە وەک حاڵەتێکی ئینسانی بۆ وەدەرخستنی نهێنییە سادەکانی «فاتە و حەمەی خوازەڵۆک» دەرگا لەسەر خانەکانی گێڕانەوە دەکاتەوەو زمانیشی تەنیا بۆ دەربڕینی ئەو حاڵەت و ڕووداوانە بەکارهێناوە.. ئێمە ناچارین هەر لە زمانی سادەی ڕووداوەوە چیرۆکەکە بدوێنین ئەوەش نزمترین ئاستی نووسینی ڕەخنەیە.
وشەی «هەشت هەزار» فاتە دەخاتە سەر پیلانێک کە تادوا دێڕەکانی هیچی لێنادرکێنێ، هەر ئەو وشەیەش حەمەی خوازەڵۆک جارێک

دەخاتە سەر ڕێگا بە ڕەونەقەکانی ژیان و جارێکی دیکە دەیخاتەوە نێو دۆزەخەکانی سواڵ.

*     *

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین شتێک لە «حسی» مێ لەو چیرۆکانەدا وە دۆزین. جگە لە چیرۆکی خوازەلۆک، کانی با، سبەینێ پێت دەڵێم. کە خاتوو گەلاوێژ نەچۆتە نێو خانەکانی ئەندێشەی مێ و لە بابەتێکی هاوبەش و سەربەخۆدا کاری کردووە. هەرسێ چیرۆکەکەی دیکە بەدوای زەنگی دنیای مێ ڕاماندەکێشن، دەمانەوێ وەک حاڵەتێکی گشتی ئەو سەرەداوانە دیاری بکەین لەناو چیرۆکەکاندا.

* پاشکۆیی ژن
* دەسەڵاتی پیاو
* داگیرکردنی ژیان و خەونەکانی مێ

- دایکم دیاربوو دەترسێ، (من لە نێوانی من و خۆمدا)
- ترسی دایک لە دیوارەکانی باوک «بەشوێن پێیەکانی دایکمدا»
- باوکم گڕی بەردایە ئەو حەزەم «خەمی نایەکسانی»
- ئەوانەی هێشتا باوکیان لە سەدەی «زیندەبەچاڵ»دا دەژین. «کۆت و زنجیر»

ئەو هێڵە هاوبەشانە زۆرن کە حسی ژن دەخوێننەوە، بەڵام هەریەکەیان بەزمان و شێوەیەکی جیاوازەوە لەو مەیدانەدا هاتۆتە پێش.

## دواوتە

* لەبەر ناسکیی بابەتەکە، بە پێویستمان نەزانی بچینە نێو خانە هەڵگیرساوەکانی دنیای چیرۆکی ئەورۆ، بەو هیوایەی ڕۆژەنوێکانَ بە هەیبەت و جورئەتێکی نوێوە سەر سامان کەن.

* خانمانی قەڵەم بەدەست دەبێ لەپێش هەمووان لەوە حاڵی بن کە داهێنان لە بواری ئەدەبی ژنان و حاڵەتە نەفسییە قووڵەکانی ژن، ئەو دنیا فراوانە فەرامۆشکراوە لە هەموو بوارەکانی دیکە مەیدانی

داهێنانی تێدا فراوانتره.

* ئێمه لێرەدا تەنیا چاوەڕێی ئەو قەڵەمە کەمانەی ژنانین کە خەونەکانی ژنان بە گەورەترو جوانترو پڕ تەواناتر پیشاندەن، بە رادەیەک کۆمەڵگا ناچار بێ رێزی ئیرادەی ژن بگرێ.

## خەونە پەشێوەکانی «کانی با» - زێنەب یوسفی

سەرەتا ئەو چیرۆکە نەک لەسەر ئاستی چیرۆکی ئافرەتان، بەڵکو لەسەر ئاستی گشتی چیرۆک سەرکەوتوو بەرزە و مەیدانی کارکردنی تێدا فراوانە.

وەک رێڕەوی باو و دیاری چیرۆک گیڕانەوە دەسەڵاتی سەرتاپاگیری دراوەتێ، هەر چەندە زمان بە «خۆرسکی» لای خاتوونی یووسفی شوێنێکی گرنگ و شایانی هەیە.

با نەش بووبێتە ئەدات و کەرەسەی سەربەخۆ و یەک باڵ، بەشێوەیەکی گشتی چیرۆکی کوردی زۆری کەم کەڵک لە تواناکانی دەسەڵاتی هەمەرەنگی زەمان وەرگرتووە.

لە چیرۆکی «کانی با»دا کە ئێمە هەر بەو نێوەی ناو دەبەین، وەختێک زمان وەک ئەداتی وەسف بەکاردێ، خانەکانی وەسف دەپەڕێنێ و شتێک زیاتر لە تاریف لای خوێنەر بەجێدێڵێ.

* پێستی پێستی روومەتیان پشکووتبوو، بۆنی لەشیان لەگەڵ بۆنی گوڵاندا ئاوێتە دەبوو «کانی با» یان زمان جگە لە وەسفی رووداو ئەرکی پێشبینی، دیاری کردنی کات وەئەستۆ دەگرێ.

* دەنگی فڕینی چۆلەکەکان، هەواڵی هاتنی کەسێکیان دەدا...

چیرۆکی کانێ با تەکنیکێکی گونجاو و هەیکەلێکی رووداوی یەک لەدوای یەک و نەپساوی هەیە.

* نەک هەر لە هەڵبژاردنی رووداو و حاڵەتە کەسیەکان لە زمان و لەوەدەنگ هێنانی مێ، جورئەت و ئازایەتی بەسەر هەموو لایەنەکاندا زاڵە.

* کەسیەتی رێبوار، چ لە بواری نەفسی و لە پێکهاتەی بەدەنی ئامادەییەکی تەواوو شازمەندییەکی کۆمەڵایەتی کاملّ بەو کارەی هەیە، کە دەشێ رێبواری ژیان و گوندو دنیا بێ.

هەر چەند هەڵدەگرێ نووسینێکی سەربەخۆی لەسەر بنوسرێ، بەڵام دیسان بەهیواین لە زمان و رووداو و تەکنیکی چیرۆکەکانی داهاتوو بێ هودەوبێ پەناو ئومێد نەبین و تاکە حاڵەتێک بە تەنیا و لە پێناو خستنە رووی ئەو تاکە حاڵەتە نەخرێتە گەڕ، لێرەدا ئەو قسەیەم گشتییە و مەبەستم تاکە چیرۆکێک نییە، ئێمە بەو بڕوایەوە ئەوە دەڵێین کە پەیامی چیرۆک هیچی لە پەیامی فەلسەفە کەمتر نییە.

## سبەینێ پێت دەڵێم... سارا ئەفراسیاب

ساراخان وەک قەڵەمێکی گەرم و گوڕی ئافرەتان هاتۆتە سەرپێ، هەر لە یەکەم دێڕەوە- ئەو سەربەخۆیەی لە نووسیندا وەک کەسێک هەیەتی - دەیبەخشێتە چیرۆکەکە، ئەو سەربەخۆیەی لە هەموو چیرۆکەکانیدا هەیە، جوانترین و گەشترین ئاکاری چیرۆکەکانی ئەون، هەر لەو خاکەشەوە چاوەڕێی هەنگاوی جوانتری لێدەکەین.

هەیکەلی گشتی چیرۆکەکە بەدوای شتێکدا.یان قسەیەکدا - لە هەر دووک بارەکەدا وەک نهێنییەک دێتە پێش - خوێنەر کێش دەکا.

چیرۆکنووس ئەوەندەی دەسەڵات هەیەو لەوە حاڵییەکە کەشف کردنی ئەو سرڕە هیچ ئیزافەیەک ناکاتە سەر دنیای گشتی چیرۆکەکە، ئەگەر ئیزافەیەک هەبێ تەنها لەرازاندنەوەی رووداوەکەدا دەبێ ئەوەش زۆر تەمەن کورتەو بونیادی سبەی لەسەر نانرێ.

ئەوەی ئێمە مەبەستمانە، توانای هەموو نهێنییەک لەگەڵ کەشف بوونی بەتاڵ دەبێ.

بەڵام تەنیا هێنانی خوێنەر بۆ بەردەم چەقۆی نهێنییەک سەرکەوتنە، چیرۆکنووس دەبێ- هەر بەونیازەشە- تا دواپلە کەڵک لەو گەشتەی خوێنەر وەرگرێ...

دووتیشک لە چیرۆکەکانی ساراخان جێگای ئومێدن، دووچەکەرە یان دووچەک
یەکەم سەربەخۆی لە چیرۆک زمان و رووداودا دووەم ئەفسونی نهێنی.

## بەزیندوویەتی بەرەو گۆڕستانیان بردم.. خەندە گۆران

ئەو چیرۆکە دەشێ بچێتە نێوخانەی رۆژانە چیرۆک یان هەڵوێستەچیرۆک، لەو چیرۆکەدا ئەو خانانەی خۆشەویستی پێدا تێدەپەڕێ خانەی سادەو واقیعین و یان خەونە مومکینەکانی مرۆڤن، هەر چەندە زمان تا دواپلەی خۆیوو تادواپلەی رووداو دابەزیوە، شتێکی بۆ سیحری وشە تێدانەماوە، ئەو حاڵەتە پەیوەست نییە تەنیا بەو چیرۆکە، شکستی سیاسی کوردو نا ئارامی ژیانی هەر لە زووەوە زمانی رووخاندووە، هەڵوێستی سیاسی وەک کەڵەگا دەسەڵاتی خۆی بە قەڵەم بەخشیوە.
ئەوەش نموونەی ئەو هەزاران کاوەیە رۆژانە دەکەونە بن پێیان.

## کۆت و زنجیر... کۆچەر نووری عەبدوڵڵا

کۆت و زنجیر واتایەکی دیکەی زیندەبەچاڵە، وەختێک ژیان دەبێتە دۆزەخ و خەونەکان ئەوساردەکرێن، نووسینەوەی یادگارەکان، کە مێژووی شەرمەزاری کۆمەڵن، وەختێک قەڵەم و دەفتەر دەبێتە ترپەک و هەناسە دەگیرێ.
ئەوە «کچی دیل» دەیەوێ لە شانۆدا هەناسەیەک بدات، بێ ئەوەی بەوە بزانێ کەشانۆش دووبارەکردنەوەی ژیانە، چونکە سۆز و حەزو دەنگ و قژ و سمێڵ و جوڵانەوەکانی سەر شانۆ تەمەن کورتن و ئەکتەری داریەدەست دێنە سەر شانۆ، بەڵام کچی ترساو «گاڵوک»ەکەی باوکی بیردەکەوێتەوەو ژیان و مردن و لێدانەکانی تەمەنی لەو چرکەساتەدا وەئاگادێنێ.

# پێرست

• ڕۆمان



• چیرۆک



• شانۆ



• گشتی

# ئازادی یا مەرگ:
# «مەرگ لە کوشتارگەی خلوود-دا»

کریت یان وڵاتی مەرگ و خوێن، کریت یان مەملەکەتی شەڕی دین و خواکان، کریت یان سەربڕینی پیاو ڕەتاندنی ژن، کریت ئامادەییەکی پڕ ئەفسانەو جادوویەکی نەبڕاوەی لەدوای هەموو وشەو ڕستەیەکدا، بەڕادەیەک کەسەکان، دین و کتێب و قەڵەم، هەواو ئاو، مەرگ و ژیان، شەراب و باران و مەرگ و کێڵگەو تا پەپاغی سوورو دەنگی بانگی موحەمەدی بۆنی کریتی لێ دێت، نەک هەر بۆن هەر هەموویان وێنەیەکی ئامادەو تێکهەڵکێشی کریتن.

* کێشە، کێشەی ئازادییە ئەو ئازادییەی کەس باوەڕی پێ نییە، ئەو ئازادییەی کە مەسیح لە جوانترین وێنەدا شاهیدی بەندبوونی دەدا.

کریت ئامێزی لێک کردەوە هاواری کرد: ئەی مەسیح من مریەمی پاکیزە نیم.

من کریتم! مەسیح گوتی وەرە پێش: کریت بەترس و لەرزەوە چووە پێش: خاچەکەی لە ئامێزگرت و لاقە بزمار لێدراوەکانی مەسیحی ماچ کرد. زاری پڕ بوولە خوێن. بەنارەنار گوتی ئەی مەسیح بۆچی منت وێڵ کردووە؟........

مەسیح بزەیەکی هاتێ، سەری بەرداوە و سرتەیەکی لەگەڵ کرد، کریت تێنەگەیشت، پرسی: چت گوت؟ ئەنگوستیلەی دەزگیرانی بوو یان ئاڵقەی دیلییەتی؟» (ئازادی یامەرگ ل٣٤٥» شۆڕشگێڕو دوژمن، پاڵەوان وبێ چەک هەموو دەزانن ئەوە ئاڵقەی دیلییەتییە، هەموو دەزانن دەبێ لە بەندییەکی حەتمیدا بژی. ئەوەش وەک چەکەرە وەک قەناعەت و باوەڕ لە دنیای ئاگایی و بێ ئاگایی هەمووواندا شینبووە.

میکێلس-ی پاڵەوان لەبەر خۆیەوە گوتی «خەتای بابەگەورەم بووە، بەڵێ خەتای بووە.. هەر چۆنێک بێ خۆشی بەکوشت چووە و ئێمەش هەموومان دەکوژرێین» «ئازادی یا مەرگ- ل٤٤» «بابەگەورە» هەرچەندە لێرە مەبەست «میکێلسەشێتەی باپیرە گەورەیانە، بەڵام دیسان مەبەست «کریتیشە» چونکە هەموو وشەکان دەلالەتێکی کریتیان تێدایە نەک بابەگەورە.

ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەو پێشبینییە پێش وەختەی پاڵەوان میکێلسە، ئەو خۆ ئامادە کردنەیە بۆ مردن، هەموو کەسەکان پرۆژەی ئامادە و بەردەستی مردنن، ئەوەش ئەگەر زیانێکی لە بونیادی یان پێکهاتەی گشتی و هەیکەلی ڕۆمانەکەدا بێ ئەوە خودی «مەرگ» وەبیر هێنانەوەیەکی بەردەوامی ئەو فەلسەفەیەیە کە نووسەر لە پێناویدا هەموو توانایەکی بابەتی و تەکنیکیی تا کریتیش بە خەرج دەدات.

* ئەگەر کریت توانای ئامادە بوونێکی ڕەهای هەبێ ئەوە مەرگ ئەو تابووتەیە یان ئەو بارانەیە یان ئەو خەنجەرەیە کریتی گەمارۆداوە.

* بەڕادەیەک مەرگی ئینسانەکان سادە تەماشا دەکرێ، بە شێوەیەک مەرگ بەسەریاندا دەکشێ، کە وەک هاوماڵ و هاو خوێن و هاوجنسی هەمووان دێتە پێش و ئەو نواو حەشارگە ئاسوودەیە کە کریت ناتوانێ بیداتە ئینسانەکانی.

* پاڵەوان میکێلس لە شەوی ئاسوودەی ماڵی بێ خەمیدا دیسانەوە دەڵێ «ئەو کریتە لەعنەتییە دەمکوژێ.» کوشتن لە بن لووتی

هەمـوویانە، سـەرەتا سـێبـەرێکی قـورسـە و دواتـر نوایەکی نەرم و پڕ حەسانەوە.

* مەرگ لە دوو چەمکی جیاوازدا.

١- وەک فـەلسـەفـە: یان وەک ئایدیۆلۆژیا، ئەگـەر بکرێ بڵـێین فەلسەفەی مەرگ، یان ئایدیۆلۆژیای مەرگ و مردن ئەوەش چەمکێکی زیندوو و گرنگی فەلسەفەی کازانزاکییە. لێرەوە نامەوێ بیروبۆچوونی زانراوی نووسـەر بۆ شیـکردنەوەو تێگەیشتن لەو ڕۆمـانە بەکاربهـێنم، بەڵکو دەمـەوێ لە نێـوان ڕووداو و وشەو بۆچوونەکـاندا فکری نووسـەر یان فـەلسـەفـەی ڕۆمـانەکـە هەڵـگرمـەوە. ئایدیۆلۆژیای مـەرگ وەک فەلسـەفە و بەرەنجامێک بۆ ڕەنجی بە خەساری مرۆ، وەک بەرەنجامێک بۆ تەمـەنی بێ مـانا و ژیانی پووچی مـرۆ ڕەنگدانەوەیەکی بێ وێنەی هەیە.

«پاڵەوان هێـشـتـا دانیـشـتبـوو، پاڵـی وەدیواری دابوو، لە تـاریکی ڕامـابوو بیـری لە پڕوپووچیی دنـیـا دەکـردەوە، (ئازادی یا مـەرگ ٢٥) پڕوپووچییـەک وەک حەتمیـەتێک بەسەر مرۆدا کشاوە، ئەو پرسیارە نەک تەنیـا ژیانی کـریتی یۆنان و نووسـەر، بەڵکو هەمـوو دنیـای شەوبگیر کردووە، تا دواتر دەڵێ: «ئەو دڵەی مرۆ قەت خۆش نابێ».

* پاڵەوان سیفاکاسی پیرو سەد ساڵە دەڵێت «ئەویش لە کوێوە دێم و بۆ کوێ دەچم. ل ٣٨٨.» پاڵەوانی ژیان و مردن، پاڵـەوانی ئەبەدی، لەو دەمـەی وەک بەردێک وەک بوونەوەرێکی پڕ هەست و ئەبەدی لە پێشوازیی مـەرگدایە، ئەو دەمـەی کریت ئاگری گـرتووەو ئەویش وەک ئەفـسـانەیەک بەپێـوە ڕاوەسـتـاوەو گـڕی کـریتی لە هەناودایە و بەو تەمـەنەوە وەک هومـێـدێکی لەبن نەهاتوو بەژیان خۆی فـێـری نووسین دەکات و وەک هەموو ئەوانەی لە دوای بەجێدەمێنن.

لە کوڕو نەوەو سامان و تێکۆشان و کریت مـانایەکیان تێدا نەبێ بۆ مـانەوەو بەردەوامی، یان بەشـێکیـان تێـدا نەبێ بۆ ئەو، تەنیـا دەبێ بەدەستی خۆی لە داروبەرد بنووسێ ئازادی یا مـەرگ کـە بەلای منەوە

«مەرگی ئازادی» یان «ئازادیی مەرگ» گونجاوترە، هەربۆیە لە بێ هومێدی بەو کولتووره مەزنەی بە جێیدێڵێ پەنا بۆ فێربوونی نووسین و نووسین دەبا کە لە شتەکانی دیکە مردووترە.

تا لە نمایش و ئاهەنگی پێشوازیی مەرگدا دەڵێ:

- «ماوەیەکە ناتوانم بنووم، بەڵێ پاڵەوانان خەوم لێناکەوێ و کرمێک» لە ناخمدا دەمخوا.. ئەو کرمەی کە ناوێرن ناوێکی لێنێن، ئەو کرمە ئەزەلییەی هەر بەڕاستی و بێ پەروا هەناوی مرۆ دەخوا. ئەو کرمە بێ هەمێتە نەک سیفاکاسی ژیرو تەمەن بەسەرچوو، نەک کریتی چوکەڵە و خوێناوی، ئەو دنیا گەورەو هەیکەلی ئەو مرۆڤە بوێرەی لە ژێر پرسیاری مانەوەی خۆی و ئەبەدی بوونی بەرانبەر لە بەین چوونی شتەکان و فەنابوونی ئینسانەکان چووک کردۆتەوەو لووتی شکاندووە.

زووتر پارە سکەواسی دەلاک دەڵێ:

- «مرۆڤ ئەگەر بخوازێ ئاسوودە بێ دەبێ بمرێ» ل ٢٠.

ئەو پاڵەوانانەی خاوەن مێژوویەکن لە کوشت و بڕین، خودی کریتن، نەیانوێراوە بیر لەو کرمە بکەنەوە، ئەوەش گاڵتە کردنە بە مرۆڤ یان بە ژیان و دواتریش بە فەنا بوون. گاڵتە کردنە بە هەموو ئەو بەهایانەی مانایەکیان بۆ ژیان هێشتۆتەوە. ئەوەش کرۆکی ئەو فەلسەفەیە، یان ترسی مرۆڤە قورسیی ئەو فەلسەفەیەی بەلێواندا نایە و ئەو بوێرییەی نییە ئەو ترسە چارەنووس سازە ڕاڤە بکات. ڕۆماننووس بە عەقڵییەتی فەیلەسووفێکەوە زۆر سادە و کارامە ئەو بەردەی لە قاندووەو ناخی ئینسانەکانی وەگومان خستووە.

گومانێک لە پێستکی یەقیندا، بەڵام یەقینێکی پڕوپووچ. ئەوەی جێی سەرنجە؛ «مەرگ» لای نووسەر نەبۆتە «هومێدێک»، نا مردن نەبۆتە ئەو کابووسەی ژیان ڕەشکاتەوە. وەک لای زۆر لە نووسەرانی هاوچەرخی- بەکاریگەربی هەردوو شەڕی گەورەی جیهان- ئەو دەورەی گێڕاوە. ئەویش لەوەدا خۆی دەدیتەوە «مادام مردن لە ڕێمانە درێژەدان بە ژیان بێ هومێدییە.» کە دەشێ بەرجەستەترین نووسەر لەو بوارە-

سامۆئیل بیکیت- بێت بەتایبەت لە چاوەڕوانیی گۆدۆدا، بەڵام لێرە- کازانزاکی- ئەو چەکەی بەبیروبۆچوونی خۆی دەوڵەمەند کردووە لە دوا هەوڵەکانیشدا ویستوویەتی ئەو دوو دنیایە «مەرگ و ژیان» لێک نزیککاتەوەو سنوورێک لە نێوانیان نەهێڵێ، کە دەشێ هەرئەوەش تاکە ڕێگای -ئەبەدییەت یان خلوود- بێت.

٢- مەرگ لە پێناو کریتدا:

لە خاڵی یەکەمدا لەوەدواین کە مەرگ وەک ئایدیۆلۆژیا و فەلسەفەی فکری نووسەر مامەڵەی دەگەڵدا کراوە. لێرەشدا مەبەستمان فکری مەرگ و فەنابوونی تاکەکانی کۆمەڵە لە پێناو نیشتماندا، لە پشت هەموو قوربانی و خوێنڕژانێک کازانزاکییەکی شۆڕشگێڕ و خاوەن باوەڕ ڕاوەستاوە. ئەوەش بە ئەرک و وەزیفەی خۆی دەزانێ وەک- مەخلووقێکی کریتی- بە تەواوی قەناعەتەوە دەزانێ کە ئەو - وەهمەی ناوی ئازادییە- تۆوێکە نەک بە ئاو بەخوێن ئاو دەدرێ.

ئەوەش باوەڕی باوی نەتەوەی ژێر دەستە «ئازادی یا مەرگ- ل ٣٢.» بێ گومان ئەو خوێنە، باوەڕ و فیداکاریی دەوێت. ئەو فیداکارییەش وەک نووسەر ڕادەگەیەنێ بە دوو هەنگاو دەکرێ.

یەکەم: «ئەو دڵەی مرۆڤ قەت خۆش نابێ ل ٤٢» ژیان گەڕانێکە بە دوای ماندوو بووندا، هەموو لەزەتەکانی ژیان شتی هیچ و بێ بایەخن، پاڵەوانی سەرکێش میکێلس «هەمیشە لە پێکەنین بێزارە» ئەوانە هەموو هەوڵن بۆ بێ ڕەونەق و ڕەشکردنی ژیان.

دووەم: کریت کە ئینسانەکان بەژیانیان پێی قەرزدارن، ئازادییەک کە ژیان بێ ئەو بێ مانایە، لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەوە دووبارە دەکرێتەوە کە مردن لە پێناو کریتدا گەیشتنە بە ئازادی یان بە خلوود.

* ئیدۆمنە کە دواتر تورکەکان لە نێو کتێب و نامە نووسراوەکانی بۆ دەوڵەتە گەورەکان سەری دەبڕن بە مامۆستای برادەری دەڵێت؛

- «کەوابوو تۆ هێشتا هیچ تێنەگەیشتووی. من بۆ ئەوەی هەست بە ئازادی بکەم، پێویست ناکا ئازادی ببینم یان دەستی لێ بدەم. من لە

نێو جەرگەی کۆیلەییشدا ئازادم. من چەند سەدە پێش ئەوە کە ئازاد بم، تامی ئازادی دەچێژم و بە ئازادی دەمرم، چونکە لە هەموو تەمەنمدا بۆ ئازادی تێکۆشاوم.» ل ۲۱۰

ئەوەش دوای ئەوەی کە زانیمان «بۆ ئەوەی خودا موجیزەی خۆی نیشان بدا دەبێ یەکێک هەڕەشەی لێبکا. گەورەکانی ئەم دنیایەش هەر ئاوان. کەوابوو چەک دەست دەیە، تەنیا لەو ڕێگایەوە ڕزگار دەبی.» ئازادی یا مەرگ ل ٦٢.

* جارێکی دیکە چەکەرەی ئەو باوەڕەمان لا دروست دەبێ کە «مردنێک» لە پێناو کریتدا کە چەند پشتە لەبن قامچی دەناڵێنێ، چەند بەلەزەت و شەرەفمەندانەیە. هەموو ئەو هەوڵانەش بۆ سڕینەوەی ئەو بەهایانەیە کە ژیان لە مەرگ جیا دەکاتەوە.

تێکەڵ کردنی ئەو دوو دنیایە لە خزمەت کریتدایە کە بونیاد و دروست بوونی ڕۆمانەکەی لەسەر ڕاوەستاوە.

* * *

لێرە ئەوە نابینین کە فەلسەفە و فکرە باوەکان ڕەتکرێنەوە، تەنیا لە ڕێکخستنەوەی وشەکان «بەوەش دەکەوینە نێو سیحری زمانی کازانزاکی» بونیادێکی دیکە و هەیکەلێکی دیکەی بیروڕاکان هێنراوەتە وجوود، دەشێ زۆرمان نەگوتبێ کە هێنانە گۆڕێ یان شێواندنی فەلسەفە و ڕاباوەکان و هەڵخستنیان لە نێو پرسیاردا؛ لە نووسینەوەی فەلسەفە گرنگترە؛ لێرە ئێمە نابینین بیروڕایەکی دیکە یان دەلالەت و بۆچوونێکی دیکە بەرامبەر «خوا» خولقابێ، بەڵام پێشگرتنەوەی ڕووداوەکان و قوتکردنەوەی وەڵامە ئامادەکان، خوێنەرو کریت تووشی خوێندنەوەیەکی دیکەی خوا دەکەن. کابرا دوای ئەوەی لە مردنی خۆی خۆشی دەبێ دەڵێ «ئەگەر خوایەک هەبێ کچەکانی من بەشوو دەدات» ئەو گومانەی لێرە دەخولقێ، گومانێکە نزیک لەیەقین، بەڵام کام یەقین؟

* کەسیەتییەکانی نێو ئەو ڕۆمانە لە کریت زیندووترو لە کاندی

بەنێو بانگترن، دووانیش لە ئاڵقەی مەرگ دووانە لە کەسەکان، هەر هەموویان کەسیەتیی گرنگن، ئەو کەسەیەتییە لاوەکییانەی خاڵە هەرە بچووکەکانی ڕۆمانەکە تەواو دەکەن و پانتاییەکی کەمیان داگیرکردووە هیچ لەو کەسە سەرەکییانە کەمتر نین لە هەموو ڕووبەری ڕۆمانەکەدا دیارن، ئەوەش تەنیا لە سەلیقەی کانزاکی جێگای دەبێتەوە. ئەو کەسییەتانە بۆنی مەرگیان لێ دێ و سەرەتا مەرگ وەک منداڵێک وەک سێبەرێک لە دوو خۆیان ڕادەکێشن دواتر مەرگ وەک کەمەند دەیانگرێ و وەک هەور دایاندەپۆشێ.

* پاڵەوان میکێلس:

هەر لەسەرەتاوە پاڵەوانێکی تەواو کامڵ و کەسییەتییەکی داڕێژراو بە دەماری دژوارو نەفسییەتی جەنگەڵییەوە دەکەوێتە سەر پێ؛ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە لەو کەسییەتییە دژوارو پتەوە- کە هیچی کەمتر نییە لە کەسییەتیی هەرە بە نێوبانگی دنیای نووسین -زۆربا- کارێکی زەحمەتە. نەک هەر ئەو ڕۆمانە، خودی ئازادی و خودی مەرگ تا کریتیش بەبێ پاڵەوان میکێلس شتی بێ مانان. یان ئەگەر خوێندنەوەو هەڵبواردنی ڕەگەزو ڕایەڵە سەرەکی و فەلسەفییەکانی ئەو ڕۆمانە کارێکی زەحمەت بێ، ئەوە توێ توێ کردن و ڕاڤە کردن و پەی بردن بە نهێنییەکانی کەسییەت و نەفسییەتی پاڵەوان میکێلس کارێکی مەحاڵە.

بۆچوونە نێو کەسییەتییەکان دەبێ بەدوای خولیاکانیدا بگەڕێی، خولیاکانی لە قسەکانیدا هەڵدەگریتەوە یەکەم وتەی پاڵەوان لە دێڕی دوانزەهەمینی سەرەتاوە دەڵێ؛

- «ئاخ کوستاروس، برا خۆشەویستەکەم، بەڕاستی ئەم کوڕە ناسک و نارنجییەی تۆ خوێنی بنەماڵەی ئێمەی پیس کردووە! خۆزیا تۆ زیندوو بای و ئەم کوڕەت وەک مشک بەلاقێک هەڵاوەسی با!».

دەشێ بڵێین ئەو کوڕەی کوستاروس کە یەکەم وتەی میکێلسی داگیر کردووە باشترین پانتایی و دەروازەیێ بۆ گەشەکردن و تێگەیشتن لە

پاڵەوانی هەرە کامڵ «میکێلس». تاکە جێگا کە ئەو پاڵەوانە تێیدا «کامڵ» بێت ناخی کوڕەکەی کوستاروسە. «ئەم کوڕە ناسک و نارنجییە دەبێ کێ بێت؟»

وەک لە تەکنیکی گشتی و هەیکەلی ڕۆمانەکەدا ڕەچاو کراوە، کەس چاوەڕێی پێگەیشتن و کامڵ بوونی پاڵەوانەکان یان کەسەکان ناکا، تەنیا ئێمە چاوەڕێی کامڵ بوونی گێڕانەوەو سیحری وشە و گرێ داهاتووی «بەسەرچوو» دەکەین. من لێرەدا بە «داهاتووی بەسەرچوو دوو مەبەستم هەیە» یەکەمیان ئەو داهاتووەی کە لەو ڕووداوانە دەدوێت بەسەرچوون، واتا ڕووداوەکان بەسەرچوون تەنیا لە گێڕانەوەیەکی بەردەوام یان داهاتوودا هەن.

دووەم: دەشێ داهاتووی سەر لەبەری مرۆڤایەتی بەسەرچوو بێ، مرۆ بەگشتی لە گێڕانەوەی بەردەوامی ژیاندایە، ئێمە ژیانێک دەگێڕینەوە یان مومارەسە دەکەین کە بەسەرچووە، هەرچۆنێ بێت لەو ڕۆمانەدا ئێمە زیاتر لە چاوەڕێی گێڕانەوەو سیحری زمان و نهێنیی کەسییەتییەکاندانین. جارێکی دیکە دەپرسینەوە ئەوە سیحری خولیایە یان سیحری تەکنیک و گێڕانەوە، لە وشەکانی هەرە سەرەتاوە میکێلس لە کوڕەکەی کوستاروس بدوێ و دوا دەرگاش هەر ئەو کوڕە بێ، دوا هەناسە و دوا وتەی پاڵەوان بۆ ئەو کوڕە بێ، ئەوەتا لە شەڕی تەن بە تەن و دەستەویەخەدا میکێلس هاوار دەکاتە کوڕی کوستاروسی برای «کسماس» دەڵێ:

– «خۆبگرە برازای خۆشەویستم گەیشتمێ»، دوا لاپەڕەی ئازادی یا مەرگ.

ئەوە سیحری کریتە، ڕق و خوێن و بوغزیان لەشەڕو بەرگریدا دەبێتە خۆشەویستی یان دەشێ بڵێین، ئەگەر میکێلس نەبا کریت چارەنووسێکی دیکەی دەبوو. پاڵەوان میکێلس کریتە، کریتێکی ئەبەدی، وەزیفە و گرنگیی ژیان لە بەخت کردنیدایە، ئەوە فەلسەفە و ڕێڕەوی میکێلسە، یان ڕەنگدانەوەی دیدی نووسەرە، بۆیەش نووسەر

تێکەڵی ئەوە دەکەین، چونکە ئەو بیرە لە بەشی هەرە زۆری کەسییەتییەکاندا ڕەنگی داوەتەوە.

* ئەوە ئەو کرمەیە سیفاکاسی باسی دەکات و دەنگبێژ دەیلێ و پاڵەوانە بە تەمەنەکان دەیگێڕنەوە، ئەگەر پاساوێک بهێنینەوە هەر ئەوەیە بڵێین ئەو بیرو فەلسەفەیە «ژیانی کریت یان کریت بۆ خۆی خوڵقاندوویەتی».

دەمانویست بواری ئەوە هەبا لە سیفاکاسی پیر بدوێین، ئەوە کارێکی سەربەخۆیە هەر هێندە دەڵێین ئەگەر کریت بەبێ میکێلس هەبێ ئەوە ژیان بەبێ سیفاکاسی بێ ڕەنگ و بۆیە.

* * *

لە دیدێکی دیکەوە دەشێ بڵێین مردنەکان «مردنی یەک مەودان»، وەختێک دەست پێدەکات «کوستاروس»ی برای میکێلس دەمێکە دەنێو کەنیسەدا سووتێنراوەو بۆتە گۆرانی و ڕەمزی خۆڕاگری و بەردەوامی، دواتر مانوساکای لە شەڕی دەستەو یەخەی پیاوانەدا دەکوژرێ و تادەگاتە کوژرانی تئودۆریسی گەنج و یەکەیەکەی کەسەکانی دیکە. لێرە کوشتن دەست پێک و کۆتاییە، ئەو مردنانە یەک مەودان، هەموو ئەوانەش قوربانین بۆ ئازادیی کریت و سەربەرزیی کاندی، ئەوەی زیاتر واشمان لێدەکات بڵێین مردنی یەک مەودا هەرئەوەیە کە هەموو مردنەکان یەک شێوەن و هەموویان بەویستی خۆیان و بۆ بەرگری لە کریت و ئازادیی ئینسانەکان بە کوشت چوون. هەموو کوژراوەکان وەک «پیاو» بێ باک و بێ دەربەست ڕووبەڕووی مردن بوونەوە، هەر هەمووشیان دواتر دەبنە ڕەمزی بەرگری. هەر هەمووشیان ڕەگی بەردەوامی لە دوای خۆیان بۆ نەوەکانیان جێدەهێڵن، بەڵام من ناتوانین لە نێو ئەو مردنانەش خۆمان لە حیکمەتەکانی نووسەر ببوێرین، ئەو وەختەی تورکە موسڵمانەکان خەریکی سەربڕینی مەسیحییەکانن لە نێو ماڵی خۆیان «بانگبێژ لەسەر منارە بانگی دەدا و تاریفی ڕەحم و بەزەیی خوای دەکرد.»ل ٢٥٦.

هەر ئەو وتەیە خوێنەر دەخاتە بەرانبەر شیرێک کە ناکرێ بەسەریدا نەڕوا.

ئەوە لەوەختێکدا «تورکی سەرسەری سەرتاشیان گەماڕۆداوە، کەس دیار نییە تەنانەت مەسیحیش» ل ٢٥٢ لەگەڵ ئەوانەشدا کەس نازانێ ئەوانە شەڕی مردنن یان ژیان، هەروەک هەموو شەڕەکانی دنیا میکێلس دەڵێت «بابە من کاتێک عاقڵ دەبم کە کریت ئازاد بێ».

پیرەمێرد بە گاڵتەوە دەڵێ:

- «کەوابوو باشترە کریت قەت ئازاد نەبێ. کاتێ مرۆڤ عاقڵ بوو، ئیتر ژیان تامی نامێنێ». ل ٢٦٨

* * *

* زۆر جار شەڕی ئەو پاڵەوانانە شەڕی ئازادی و بەرگری نییە ئەوەندەی شەڕی ئەتک کردنە، زۆرجار شەڕو کوشتار دەبێتە پەیامێک و پاڵەوانەکانی کوشتار دەبێ بیگەیەنن، خەڵکیش وەک پەیڕەوێکی ئەوان سەرکردان ئەوە بەشدارن لە گەیاندنی ئەو پەیامەدا.

* هەربۆیەش مەرگم هەڵبژارد، چونکە لە دەرگای هەر کەسییەتییەک و هەر ڕووداوێک و دیاردەیەک بدەین لەو ڕۆمانەدا دەمانباتەوە سەر فێرگەکانی شەڕ و گۆڕستانەکانی کوشتار، هەموو کەسەکان لە سیفاکاسی سەد ساڵەوە تا تراساکی منداڵ بەحیکمەتی فەیلەسووفێکەوە بۆ شەڕ ئامادە کراون، تا پەیڤەکانی عەشق و ڕۆژەکانی دڵداری و پەیامەکانی ژن و مێردی پڕن لەو توندو تیژییەی لە مەیدانی شەڕدا هەیە.

* بەبێ ویستی خۆم، یان بێ ئەوەی بزانم لەبارەی نووسەرێک هاتوومە قسە، کە لەکاتی خوێندنەوەی شاکارەکانی «کە هەموو کارەکانی شاکارن» هەست دەکەم نووسین لەدوای ئەو کۆتایی هاتووە، ئەو وەک پەیامبەرێک پەیامی قەڵەمی بە تەواوی گەیاندووە.

* درود بۆ کازانزاکی و دەستخۆشی بۆ قەڵەمی مامۆستا کەریمی حسامی.

# کوێری

ئەگەر ئەمانەتی نووسین و لێدوان لەکتێب بتوەستێنێ و هەڵوەستەت پێ بکا، ئەوە نووسین لەسەر ڕۆمانی کوێری چەندان هەڵوەستەی دەوێ، چونکە پێش ئەوەی من بێمە دەنگ و شتێک بڵێم، دەنگێک، دەنگێکی بە ئەزموون و زانا پێم دەڵێ:
- وریا بە، سەرەتا ئەوە بزانە کە ئەو ڕۆمانە خەڵاتی نۆبلی پێ دراوە.
- ئەوەش بزانە کە ئەو بیرمەندانەی ئەو ڕۆمانەیان هەڵبژاردووە پیاوی ئەدەب ناس و یەکە یەکەن.
- ئەوەش بزانە کە ئەو ڕۆمانە وەرگێڕدراوەتە سەر بیست و شەش زمان و زیاتریش ئەگەر لە دوای هەموانیشەوە بێ، دەبێ قسەیەک بکەین.

***

* دەشێ ڕۆمانی کوێری لەوەدا تاقانە بێ- کە بە گەرم و گوڕی- دوای هەشت ساڵ لە نووسین گەیوەتە نێو ئەدەبی کوردی.
* **نێونیشان.** سەرناوی ڕۆمانەکە هەڵگری تەواوی دەلالەتەکانی

ناوەرۆک و نووسینی رۆمانەکەیە، لەو رۆمانەدا بەرەو رووی دنیایە دەبینەوە، دنیایەکی تەواو چاوەڕوانکراو و هەست پێکراوە. دنیایەک کە دەبێ مرۆڤ بەبێ بینین کەشفی بکات، جارێکی دیکە مرۆڤی بێ چاو خۆی بە دنیا بناسێنێتەوە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە ئەو دنیایە دنیای ئاسایی کوێران نییە، دنیایەکە چاو ساغێک بۆی رەسم کردوون، چونکە دنیای کوێران هێندە نەدیو نییە. واتە ئەو رۆمانە، ئەو دنیایە نییە کە کوێرەکان لەتاریکیدا دەیبینن یان دەیخولقێنن. ئەو فەزاو دنیایەی رۆنراوە ئەو دنیا پڕ سیحرەی کوێران نییە کە نهێنییەکانی بوونی تێدا کەشف دەکەن، کە ژیانی تێدا دەناسن و ئولفەتی پێوە دەگرن.

* ئەو کوێرانەی دوای ئەوەی «بینین» لەدەست دەدەن، ئیتر ژیان دەبێتە کابووسێک و دەرگایەک نییە لەگەڵ ژیان ئاشتیان بکاتەوە.

* ئەگەر بکرێ بڵێین نووسەر دەمانباتە دنیایەک کە «دیتنی» تێدا نییە، بەڵام ئەو دنیا ئامادەکراوە، گوتارێکی تایبەت بەخۆی، یان تایبەت بە حاڵەتی کوێری نییە. دەکرێ بڵێین دەچینە ناو گێژاوی کوێری بێ ئەوەی هەستی کوێر بوون بپشکوێ.

* کوێری لێرە دەبێتە حاڵەتێکی هەست پێکراو بەبێ رووداني گۆڕانێکی بایۆلۆژی، ئەو حاڵەتەی کەسی بەرانبەر یان تێکەڵ بوو داگیر دەکات و تووشی دەکات، خاوەن حاڵەتەکان «کوێری» دەگەنە خانەیەکی هێند بەتاڵ کە جێگایەک نامێنێتەوە بۆ لێبوردن و سۆز.

* ئەو دنیایەی بەنێوی کوێری خەڵق کراوە، چونکە گوتارێکی تایبەت بەخۆی نییە هەمیشە پێویستی بە چاوێک هەیە تا دنیا لەنێو ئەو تاریکییە بێنێتە دەرو رۆشنی بکاتەوە. چاوەکانی ژنی پزیشک ئەو نیگا فراوانانەن کە رۆمانەکەیان دیتووە یان نووسیوەتەوە، یان بە حیکایەتیان کردووە، واتە لە ئەنجامدا ئەوە «چاوە» ئەو رۆمانەی کوێریمان بۆ دەگێڕێتەوە، واتە لەنێو ئەو کوێر بوونە قورسەدا نیگایەک نییە بێجگە لە چاو دنیا رۆشن بکاتەوە یان شتەکان بناسێنێ.

*** کوێری وەک بەڵایەک.**

ناکرێ کوێری لەو خانە سادە نەیەتە دەرێ و هەر تەنیا راڤەی حاڵەتێک بێت کە دەکرێ مرۆ لە دەستی بدات و پشت بە حاسەیەکی دیکە ببەستێ لە کاتێک بینین دەشێ بونیادی تەواوی ماهیەتی هەستەوەرەکانی دیکەش تێک بدات.

وەختێک کاربەدەستان تێدەگەن ئەوە نەخۆشییەکی پەرە گرە، دەبینین لەبەردەم، دەستەڵاتدا ئینسانەکان چۆن هەموو ماهیەت و گەوەرەیی خۆیان لە دەست دەدەن، چونکە مرۆڤەکان بەهایان وەک هاولاتییەک تەنیا لە بینیندا بچووک دەکرێتەوە، دوای نەمانی توانای بینین، واتە توانای جیاکردنەوە، رەخنەگرتن و ناسین، هەموو ماهیەت و دروشمی رەنگاو رەنگەکانی دەسەڵات بەرانبەر هاوولاتیان دەبێتە زەبرو زەنگ و چەند یاساو وشەیەکی بێ سۆزو پڕ قین.

ئەوە وجوودی راستەقینەی هەڵپەی دەسەڵاتە لەو پەری شارستانییەتدا، تەنیا ئەو کاتە خاوەنی هاوولاتیانە کە تواناکانیان کۆنترۆڵ کات و هێزیان بۆ رەنگین کردنی خۆی بە خەرج بدات.

*** گرنگی بینین:**

ئەو دەمەی بینین دەبێتە ئەفسانەیەک و هەموو هەستەوەرەکانی دیکەی مرۆڤ بێ بایەخ دەکات. واتا بینین دەبێتە ئەو ئەفسانەیەی کە بەبێ ئەو هەموو تواناکانی دیکەی مرۆڤ بۆ پێوەندی کردن بەدنیاو دیاردەکانی و دەوروبەری هیچ کاریگەرییەکیان نییە، جگە لەوەی لە زەتێک بۆ مانەوەی ئەو زیندەوەرە «کوێر بووە» ناهێڵێتەوە، توانای بەردەوام بوون، چاوەڕێ کردنیشی لێدەستێنێتەوە.

«ئێستا کەوا دیارە هەموو کوێر دەبین ئیتر کێ لەبیری جوانی و جوانی ناسیی و پاک و خاوێنی دایە» کوێری ل١٤٠.

* ناوەندی بێ بایەخ کردنی کوێرەکان یان ئەوانەی تووشی بەڵای کوێری بوون، ئینسانەکان خۆیانن، ئەوانن ئەوە رادەگەیەنن کە دنیا لەو دیو تەمی سپییەوە هیچە.

حاڵیبوون پەلکێش دەکەن، بەڵام ئەوە ئەو راستییە ناشارێتەوە کە هەموو ئەوانە خراونەتە خزمەتی شێوە داشۆرین و سەتیرییەکەی «Satire» کە مەبەستی سەرەکییەتی.

٣- دۆن کیشۆت یەکێکە لەو داستانە کەمانەی کە دەتوانرێ لە هەموو سەردەمێک و لە هەموو سیستەمێکی کۆمەڵایەتیدا بخوێندرێنەوە، ئەوەش لەوەوە دێ کە «سێرڤانتێس» گرنگیی بەخەم و برینە قووڵ و سەرەکی و ئێشە نەبڕاوەکانی ناخی مرۆ داوە، کە شایانی پیر بوون و سارێژ بوون نین.

* «من هەر پاڵەوانم و دەمەوێ بە پاڵەوانیش بمرم. من ناڕاستم راست کردۆتەوەو خراپم چاک کردووەو دێوم بەزاندووەو ململانێی جندۆکانم کردووە». دۆن کیشۆت لاپەرە ١٩٣»

* «ئیدی بەهەر چوار قوڕنەی جیهاندا، دوای کارەسات دەکەوم و یارمەتیی هەموو زۆر لێکراوان دەدەم و ناڕەوایی، وەک ئەرکی هەر پاڵەوانێک، راست دەکەمەوە.» دۆن کیشۆت ل٢٦.

لێرەدا مەبەستمان نییە داخۆ ئەو قسانە لەچ بارێکدا کراون، بۆ «وشەی پاڵەوانیش» تەنیا هەر هێندەی لێ وەردەگرین کە «هەموو ئالیەتەکانی هێزو گۆڕان و خاوەن حەق ودادو فیداکاری تێدا کۆبۆتەوە.» ئەوەی مەبەستمانە و بناغەی دەربڕینەکەیە ئەوەیە «من ناڕاستم راست کردۆتەوەو خراپم چاک کردووە» یان «ناڕەوایی.... راست دەکەمەوە.»

ئەوە بەڕێکەوت نییە کە ئەو بیرو دەربڕینە لەیەکێک لەوتە هەرە بەنێوبانگەکانی «شکسپیر» دەچێت کە لەسەر زمانی «هاملێت»ی گەورە کەسایەتیی زیندووی شانۆ دەڵێت:

(The life is out of joint,
Ever I was born to set it right)

واتا «دنیا لە رێکوپێکی بەدەرە، من تەنیا بۆ راستکردنەوەی ئەو ژیانە خوڵقاوم».

ئێمە نامانەوێ یان کارێکی بێهوودەیە بیر لە توانا ماددییەکانی ئەو بیریارانە بکەینەوە بۆ گۆڕینی ژیان و راستکردنەوەی دنیا.

لێرە دەمەوێ لەو رایەی رەخنەگری هەرە ناسراوی دنیا «بلینسکی» بدوێم کە دکتۆر میترا لە پێشەکییەکەدا پەسنی کردووە.

بلینسکی رای وایە کە بیروڕایەکانی دۆن کیشۆت بەرزو پیرۆزن، بەڵام رەفتارەکانی گاڵتە ئامێزن و نازیرەکانەن «زیرەکانەنین» دکتۆر میترا-ش بۆ پەسنی ئەو قسەیە دەڵێ:

«لە بری بەکارهێنانی توانستە واقیعییەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجە بالاکانی......

«بەکەسێک دەچێ کە بیەوێ یارمەتی یەکێ بدا کە لەو دیو دیوارەکەوە کەوتبێ و بناڵێنێ، بەڵام نەزانێ چۆن یارمەتیی بدا، بە توندی خۆی بە دیوارەکەدا دەدا و سەروگوێی خۆی خەڵتانی خوێن دەکان» دۆن کیشۆت ل ١٣.

ناکرێ من لێرە لەوتە و بیری ئەو زانایە گەورانە رەخنەبگرم یان مەبەستێکی وام نییە، ئەوەش رێگای ئەوەم لێ ناگرێ کە بڵێم:

- سێرڤانتێس چەند سەدە پێش ئێستا لەو راستییە گەیشتبوو کە وەزیفەی ئەدەب گۆڕانی کۆمەڵگە نییە بەشێوەیەکی «فیعلی»، دەکرێ بپرسین کام نووسەر لەوانەی ویستوویانە «توانستە واقیعییەکان» بەکاربهێنن بۆ گەیشتن بە ئامانجە بالاکان، سەرکەوتوون.

ئێمە تەنیا ئەوە دەبینین کە لە هەموو حاڵەتەکاندا هەوڵدانی نووسەر بۆ گۆڕینی واقیع «بەشێوەیەکی فیعلی» تەنیا سەرکێشانە بە دیواردا. بەشێوەیەکی دیکە دەتوانین بڵێین کە یەکێکی دیکە لە حاڵەتە پەنهانەکانی دۆن کیشۆت «گاڵتەکردنە بە گۆڕینی کۆمەڵ لە نووسیندا» یان بەهۆی هەوڵی تاکە کەسی و پاڵەوانبازی.

*　　*　　*

دۆن کیشۆت رۆئیاو بۆچوون و خولیای نووسەرۆ چاکە خوازەکان دنیایە یان پەیکەری ئەو نەفس و هەست و شعوورە بەرزەیەکە پڕە لە

لێرە دەبینین مەرزی جوانکاری و مەرزی ئەخلاق لەو دیو بینینەوە کۆتای دێت، پانتایی کوێری پانتاییەکی بەرەڵلاو گێرە شێوێن و وێرانە.

***

ئەوەی جێگای سەرنجە ، لێستاندنەوەی توانای بینین، نابێتە پانتاییەک بۆ بیر کردنەوەو رۆچوون، نابێتە خانەیەک بۆ تێگەیشتن و حاڵی بوون، نابێتە رووکاری پشکۆتنی هستەوەرەی دیکە و مەودایەک بۆ ژیان. لێستاندنەوەی توانای بینین هەموو ئیمکانیاتە بەشەرییەکان تێکدەشکێنێ و وێرانیان دەکات، لەسادەترین حاڵەتدا نابێتە ئەندێشەیەک یان تێڕامانێکی جددی بۆ بینین و رۆشنکردنەوەی ناخ.

«هێندەی پێناچێ دەبن بە جانەوەر، جا لەوەش خراپتر جانەوەری کوێر» ل١٤٦.

* وەک بەرەنجامێک بۆ فکری بنەڕەتی رۆمانەکە، لەودیو بینینی چاوەوە شتێک نییە، لەو دیو بینینەوە دینا وێرانەیەو مرۆڤ مەخلۆقی بێ هومێدو سەرلێشێواون. فەلسەفەیەک یان فکرێکی گشتی لە پشت حاڵەت وفەزای وتووێژەکان وەستاوە، ئەویش ئەوەیە ئەو شتانەی کە دەیانبینم هی منن، ئەو شتانەی کە دەیانبینم لەزەتیان لێ دەکەم، ئەو زانیارییانەی کە دەیانخوێنمەوە بەچاو مومارەسەیان دەکەم، ئەزموونی منن، دەتوانین ئەوەش ناو بنێین. بینین وەک ناوەندی بوون، یان بینین وەک تاکە یەکەی وجوود.

-(دەتگوت ئەگەر بێتو هەموو لایەنەکان لەبەرچاو بگرین، شتێک لەم دنیایەدا نییە کە تەواوی هی ئێمە بێت، دیارە ئەوەش راستییەکی زۆر روون و ئاشکرایە) ل١٥٧.

*** من لە دەنگما خولاسە دەبمەوە.**

ئەوکوێرییەی دنیای داپۆشیوە، شتێکی نەهێشتۆتەوە بۆ ناسین، دنیا بێدەنگ پاڵی داوەتەوە، کوێرەکان بێدەنگ تێدەپەڕن، شار و وڵاتی کوێر زبڵ - بەقسەی ژنی چاو پزیشک- دایپۆشیوە. لێرەوە پێمان

دەڵێ تەنیا دەنگ پێناسەی بوونیانە.

- ژنەکەی بێ لەڕوو دامان ئەم پرسیارەی هێنایە گۆڕ، ناوتان چییە، ئینسانە کوێرەکان پێویستیان بە ناو نییە، من لە دەنگما خولاسە دەبمەوە، شتێکی تر گرنگ نییە.

لێرە باران لە دەنگەکەی و با لەگڤەی و هەور لە گرمەیدا وجوودیان هەیە، ئەوەش سڕینەوەی حاڵەتەکانی دیکەی باران و باو هەورە، سڕینەوەی کاریگەری شتەکانە بە لێستاندنەوەی دەنگ.

* کوێری، سەرەتا ناوەکان دەسڕێتەوە، یەکەم کوێر ناوی دەبێتە کوێرە پیاو، جا ژنی کوێرە پیاو پیرە کوێر و کچەی چاویلکەیی وکوڕە خێل.. ئەگەر ئەوە بزانین دوا سیفەتی چاو روونیان دەبێتە ناویان، مەحف بوونەوەی ناوەکان، مەحف بوونەوەی تاکەکانە، مەحف بوونەوەی تایبەتییەکانی هەر کەسێکە، تێکەڵ بوونی، ئەگەر بکرێ بڵێین «شعوری جەمعی» دروست دەکات، شعورو هەستی ئەو پیاو و ژنە کوێرانەی ناتوانن لەگەڵ کوێر بوونیاندا بژین، یان لەگەڵ بوونی خۆیان وەک کوێرِ یەکتر بناسن، هەر ئەو کوێرانە ناشتوانن بۆ رووناکی بگەڕێنەوە، ناخی ئەوکوێرانە پڕە لە ئەزموونی بەر رووناکی، پڕە لە یادگاری بەر گڵۆپەکان و پیاسەی بەر هەتاو، پڕن لە خوێندنەوەی بەر چراو مۆمەکان، مێشکیان وێنەی رەنگاو رەنگی جیران و کەسوکارو هاو دەمەکانیان، ئەو کوێرانەی لە چرکەیەکدا لە رووناکی دادەبڕێن و دەکەونە نێو بەحرێکی سپی، شاشەیەکی سپی بەرچاویان غەرق دەکات، ئەوەی جێگای تێڕامانە ئەو مرۆڤ گەلە نەدەتوانن بگەڕێنەوە بۆ سەردەمەکانی رووناکی و نەدەشتوانن لە کوێریدا بژین. ژیانِ لە نێوان دیتن و نەدیتن دەبێتە ئەو ئەفسانەیەی کە هومێدێک نییە بۆ هێنانە دی.

هەر بۆیە ئەو کەسانەی لەبەر رووناکی کە ئەزموونێکیان هەبووە خاوەنی ناوی روون و رووناکی خۆیان بوون، بەڵام ئێستا ئەوان لە نێو تەمێکدا دەژین کەهۆیەک نییە بۆ ناونان و هۆیەک نییە بۆ

جیاکردنەوەی یەکتر، ئەگەر ناو دیارترین نیشان و سیمبولی جیاکردنەوەی ئینسانەکان بێ.

*** دوا داو:**

- دەبێ لە بەختەوەری خۆمان شاد بین کە هێشتا جووتێکمان چاوی ساغ لەگەڵە، ئاخرین چاوی روون و گەشی دنیا، ئەگەر بێتو رۆژێک ئەو چاوانەش کوێراییان دابێ، یانی ئەو مەبەستەی قەت پێم خۆش نییە هەر بیریشی لێ بکەمەوە، ئەو دەم ئەو داوەی ئێمەی لە ئینسانیەت گرێ دابوو دەپسێ.ل٣٣٦.

دەمەوێ ئامادەبوونی دووچاوی ساغ هەر لەسەرەتای رۆمانەکە، لە بونیادی گشتی و تەکنیکی گشتیدا بۆ دواتر هەڵگرم، تەنیا لەو داوە دەدەوێم وەک مانای وشەکە، ئەو داوەی ئەو مرۆیانەی لە ئینسانیەت بەستووە، واتا ئەو داوە سنووری یەکلاکەرەوەی نێوان ئینسانیەت و حەیوانیەت یان وەحشیەتە.

ئەوەش نەک کوێرەکان، بەڵکو هەموومان دەخاتە بەردەم خەندرکە ترسناکەکانی سبەی، کە دەشێ «بینین» وەک زەنگیانەیەک ون بێت و ئینسانیەت بکەوێتە ناولیتاوی بەدرندە بوون و وەحشیەت.

بەرای من ئەوە زوڵمێکە لە توانا بێ سنوورەکانی فکر بۆ پێکەوە ژیان و هەوڵە بەردەوامەکانی جەستە بۆلێک حاڵی بوون.

- کچە چاویلکەیی گوتی.. هومێدی دۆزینەوەی دایک و بابم، هومێدی گەرانەوەی دایکی ئەو کورە... وا دیارە لە بیرت چوو باسی ئومێدێک بکەی کە هەموومان پێیەوە زیندووین، چ هومێدێک، ئومێدی گەرانەوەی سۆمای چاوان ل٣٣٧ کوێری. ئەوە هومێدی کچێکە بەسبەی، هومێدە سادەو ئاسانەکان، ئەوە ئاگایی ئەو کچەیە کە نوێنەری گەنجیەتی و لەزەتە لە نەبرانەوەی ژیان و کۆتایی نەهاتنی خەونەکان، بەڵام دەنگێک بەهەمان ریتم و بەهەمان زمان وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ:

-خۆ هەڵاوەسین بەم هومێدانەوە کارێکی بێهوودەو شێتانەیە/کوێری

ل٣٣٧ ئەوە بەرهەم هێنانەوەی عەقڵە، ئەوە زمانی عەقڵە لە سادەترین شێوەدا، ئەوە زمانی فەنا بوونی ژیانە لە قووڵایی فکرو بیرەکاندا.

***

ژوزی ساراماگۆ، دنیایەکی دوور لە بینین و تیشک دەخوڵقێنێ یان دنیایەکی کوێر دێنێتە بەرهەم، دەیەوێت دنیا لە تاریکیدا بخوێنێتەوە یان دنیا لەبەردەم سۆمایەک کە تەنیا سامالێکی سپی داپۆشیوە وەخوێنێ. دنیا لەو کاتەدا ببینێ کە هەموو شتەکان تێکەڵ دەبن و هەموو نیگاو تەماشاو سەرنجەکان دەچنە ئەو دیو پەردەوە، بەڵام لەبەرهەم هێنانەوەی دنیایەکی کوێر لە دوو خاڵدا بەربەست هەیە:

یەکەم: لە پشت هەموو دێرەکانەوە دووچاوی ساغ دەدرەوشێتەوە، دوو چاو هەموو شتەکان دەگێڕێتەوە، دوو چاو لەو دیو دنیای کوێر، گەش وەک چاوی تەواوی بەشەریەت هەموو عەقڵەکان و پیاوە ون بووەکان ڕێنوێنی دەکات و یادگارەکان دەنووسێتەوە. بەبێ ئەو دوو چاوە ڕۆمانی کوێری دنیای نەدەدی، بۆیە ئەوە هەرگیز ڕۆمانی کوێری یان کوێرەکان نییە.

ڕۆمانی دوو چاوی کراوەو زیرەکە، کوێرەکان تەنیا وەک بابەت و ماتریاڵ یان مەیدانی چالاکی ئەو دوو چاوە ئامادەن، کوێرەکان تەنیا ئەزموونی تەمەنێکی نێو دوو چاوی ئاگاو شارەزان، دوو چاو کە هێندەی ئینسانیەت دەبینێ. ئەو دوو چاوە ڕەمزی هۆشمەندی و تۆمارکەری دنیان، دنیایەک بە کوێری وەڕێکەوتووە، ئینسانەکان بە دوو چاوی زەقەوە تێدەپەڕن، بە دوو چاوی پڕ بینینەوە رادەبوورن، بەڵێ ئینسانیەت تێدەپەڕێ و خەراباتێک لە دوای خۆیەوە جێدەهێڵێ.

خاڵی دووەم: هەر بۆ پشتگیری ئەوەی کە ئەو ڕۆمانە کوێر نییە، بەهەستی دوو چاوی ساغ و بە ڕووناکی حیکاتەکان نووسراوەتەوە. بەبێ ئەوەی حسێکی کوێرانە لە داڕشتنەوەی ئەو حیکایەتانە بەشدار بێت.

**تـەكـنـيـك:** لێـرە زمـان رابەری سـەرەكی و ئـالیـەتی بنەڕەتی چیرۆكەكانە، چونكە لەگێڕانەوەدا تەنیا زمان سەرف دەكرێ و بەخەرج دەدرێ، بەخەرج دانی زمان لە بەحیكایەت كردنی حاڵەتە هەرە دژوارو ژیانە هەرە جەنجاڵەكان، لێرە زمان ژیان لە بەتەكنەلوژی كردنی دنیا دەردێنێ و جارێكی دیكە دەیكاتەوە بە حیكایەت، چونكە ژیان وەك ئەو پیاوە پیرەی هەموو حیكایەتەكانی خۆی گێڕاوەتەوە یان ئەزموونی كردوون، دەترسێ حیكایەتێك نەمێنێ بیگێڕێتەوە یان سبەیەك نەمێنێ بەرهەمی بێنێتەوە ئەوەش كۆتایی دنیایە. پیاوەكان لەوەدا پیر نابن چەند ژیاون، ئینسانەكان لەوەدا پیر دەبن و دەمرن كە حیكاتەكانیان كۆتاییان دێت.

* دەست خۆشی بۆ برای وەرگێڕ سەلاحەدین ئاشتی بۆ ئەو زمانە پاراو و كوردییە جوانەی.

# گێژاوی ئەسپ و ژنانی عاشق

ئیستاتیکا دەگەڵ هەناسەی مرۆ رژاوەتە سەرزەوی، یان مرۆ جوانکارییەکانی دنیای درویێنە کردووە، وەختێک مرۆ قاوغی تەسکی «لاسایی سروشتی» شکاندو باڵی بەخەون گرت و ئەفسانە خوڵقا. دواتریش ئەو وێنەو تابلۆ هونەرییانەی ئەفسانەکانیان دەگێڕایەوە، بوونە سەرەتای کەلەپوورو شارستانی شێوەکاری دنیا. ئەو کارە هونەرییە پڕ سیحرو جوانکارییانە، لەپشت گێڕانەوەی ئەفسانەکان شتێک یان ئیلهامێکیان جێ دەهێشت کەبەهای کلتووری و رۆشنبیرییان لە ئەفسانەکان کەمتر نەبوو.

دەتوانین ئەو تێکەڵ بوونی ئەفسانە و شێوەکارییە (هەرە سەرەتاکانی دنیا) بەیەکەم خەمڵین و گەشەی بەرزی هەردوو هونەر دابنێین، ئەو پەیکەرو تابلۆیانەی بۆ ئەفسانە کۆنەکان کراون بەهێزێکی لە زمان گەورەترو کاریگەرترەوە ئەفسانەکانیان گواستۆتەوە، بوونە هونەرێک و بابەتێکی تەواو سەربەخۆ و دیار. ئێستا تەنیا تابلۆ و پەیکەرەکانی ئیکارۆس و دیدالۆس و زیۆس... بەسن بۆ گێڕانەوەی تەواوی ئەفسانەکان. ئێستا بەهای شارستانی و کلتووری پاشماوە هونەرییەکان و کارەکانی شێوەکاری یۆنان، لە پەیکەری خواوەندەکان و تابلۆ و هەڵکەندراوی کەسە ئەفسانەیی و سیحرییەکانیان لە خودی ئەفسانەکان زیاترە.

ئەگەر بکرێ بڵێین باڵاترین تەقینەوەی هونەری زمان و بەکاربردنی لەرۆمان دایە، شێوەکاریش هونەری جوانکاری و ئیستاتیکایە.

## تابلۆ و رۆمان

یەکێکە لەو کتێبە دەگمەنانەی کە خوێندنەوەیەکی مەیدانی و لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی بۆتێکەڵ بوونی ئەو دوو دنیا باڵایە «شێوەکاری و رۆمان» کردووە.

لەچواردە بابەتی سەر بەخۆدا لەبەشی زۆری ئەو رۆماننووس و داهێنەرە بەناوبانگ و بەرزانە دواوە کە توانیویانە بەکار بردنێکی هونەری لەسەر کاری یەکێک لەشێوەکارەکانی دنیا بکەن.

سەرەتا رۆماننووسی بێ وێنە (ستاندال) لە رۆمانی هەرەنەمریدا (سوور و رەش- ١٨٣٠) تابلۆی گیر سینو «ولیام ئەکوینی پیرۆز» و (جۆرج ساند) تابلۆی «سەمای مەرگ»ی (هولباین) یان بەکار هێناوە.

دواتر رۆماننووسە نوێیەکان زیاتر چوونە پێش، بەهۆی تێکەڵ بوونی هونەرەکانەوە زیاتر کەڵکیان لەتابلۆو هونەری شێوەکاری و پەیکەر وەرگرتووە.

بەکار بردنی تابلۆ بەنێو بانگەکانی دنیا لەوانە «کۆڵکە زێرینە»ی شێوەکاری بەنێو بانگ (فرا ئەنجیلکو)، هەردوو تابلۆی بەنێو بانگ «بەرز بوونەوەی یوحەنای پیرۆز بۆ ئاسمان»ی (جیوتو)، تابلۆی «گریگۆری پیرۆز مەرگی ڤینای پیرۆز رادەگەیەنێ»ی هونەرمەند (گیرلاندابۆ)، تابلۆی «مەسیح لەنێو قەبر»ی (هۆلباین).... تا دەگاتە تابلۆی هەرە بەرزو سیحری «گێژاوی ئەسپ»ی (مارک جیرتلەر).

## گێژاوی ئەسپ، ژنانی عاشق

لەو کتێبە بەنرخەی (جیفری میرز) ئەگەر بتوانین تەنیا لەوتاکە لێکۆڵینەوەی بدوێین بەو نێونیشانەی سەرەوە کارێکی بەبایەخە.

(دی. ئێچ. لۆرانس) بلیمەتی هونەرەکان، بەقەڵەمی سیحری و

هەستی فەلسەفی بووە یەکێک لە کۆڵەکە هەرە نەخشین و بڵندەکانی رۆمانی نوێ، جگە لەسەلیقەی بەرز و خەیاڵی بڵاوی، توانای هونەری ئەو بلیمەتە شوێنکارێکی ورد و رەنگینیان لەسەر کارەکانی جێ هێشتووە. (لۆرانس) ئەو راستییەمان پێدەڵێ کە زمانێک بۆ دەربڕین بەش ناکات. ئەو زمانی وشەو توانای رەنگی تێکەڵ دەکرد.

## لۆرانس و گێژاوی ئەسپ

دوای تێپەڕبوونی دوو مانگ بەسەر دیتنی وێنەیەکی فۆتۆگرافی تابلۆیەکی بەنێوبانگی (مارک جیرتلەر)، ئەویش تابلۆی «گێژاوی ئەسپە- ١٩١٦» (لۆرانس) بەنامەیەک جیرتلەری شێوەکار ئاگادار دەکاتەوە کە تابلۆیەکەی وەک نەحتێکی بەرز هاتۆتە بەرچاو، ئەوەشی لێناشارێتەوە کەلە رۆمانەکەیدا «ژنانی عاشق» «پیاوێک هەیە- تۆ نیت» خەریکی کاری هونەرییە لە بنمیچی کارگەیەک، ئەو کارە هونەرییە «گێژاوی ئەسپەکەتە» هەر چەندە (لۆرانس) دڵنیایە کە هونەری شێوەکاری بۆ دەربڕین کامڵترە.

بەڵام ئەوانەی (مارک جیرتلەر) دەناسن و ژنانی عاشقیان خوێندۆتەوە، دڵنیان کە ئەو پیاوە هونەرمەندەی (لۆرانس) باسی دەکات «جیرتلەر»ە

* بەکار بردنی ئەم تابلۆیە چۆن؟
* هەست و سەلیقەی لۆرانس و شارەزایی لەشێوەکاریدا
* ئامادەیی کەسایەتی «مارک جیرتلەر» بۆ بەکار بردنی لەرۆمانی «ژنانی عاشق»
* دەگمەنی و بالآیی تابلۆی «گێژاوی ئەسپ»

ئەوە جگە لە بوغزاندنی جوولەکە لەلایەن لۆرانسەوە و جۆرێک لە «حەسادەت». ئەو خاڵانە ئامادەییەکی بەردەوامیان هەیە لەسەرکەوتنی لۆرانس لە کارەکەیدا، ئەوە جگە لەو هۆکارە شاراوانەی لە تابلۆیەکەو (مارک جیرتلەر)دا لەلایەک، لە رۆمانی ژنانی عاشق و لۆرانس

لەلایەکی دیکە رۆڵیان هەبووە.

هەردوو کارەکە پەنگاوی دەربڕینیان یەکە یەکیان بەوشەو ئەوی دیکە بەرەنگ

* هەر دوو هونەرمەند کەسایەتی ئاڵۆزو دەروونێکی گرژو شێواویان هەیە

* رابردوویەکی زۆر لێک چوو لەپێوەندی جنسیان.

* دژی شەڕ

* هەرتکیان تووشی نەخۆشی سیل ببوون نەک هەر ئەوە دکتۆر (ئەندرۆ مورلاند) چارەی هەردووکیانی کردووە.

هەر بۆ نموونە «لەساڵی ١٩١٦ وەختێک هەردووکیان (جیرتلەر) و (لۆرانس) لە هەژاری و نەدارییەوە دەست کەوتی ئەکادیمی و سەرکەوتنی هونەرییان بەدەست هێناو بوونە برادەر. کاتێک (جیرتلەر) بەدەست کارنگتۆنی شۆخ و شەنگەوە دەیناڵاند، لۆرانس تووشی کێشەی جنسی ببوو لەگەڵ فرایدا و ئال حوری لە کورنوال.»

* گێژاوی ئەسپ، لووتکەی داهێنان و تەقینەوەی توانای کپ بوونی جیرتلەرە، تابلۆیەک پڕ لەسەرباز و ئەسپ و جنس، جنسی رژاو لە ئەسپ و ژن و هێڵە توندو رەنگە گەرم و هەناسە تێکەڵەکان.

* لەو تابلۆیەدا (جیرتلەر) وێنەی شازدە سەرباز دەکێشێ، دەریاوان و ژنان و کچانی باڵق لە دانیشتنێکی سەربازی شلگیردا، بەهۆی هێزێکی ناوەندی بەهێز دەسوڕێنەوەو (هکسلی) دەڵێ «رەنگەکانی (جیرتلەر) هەمیشە بەهێزن، بەڵکو توندیشن» ل ١٠٣ «تابلۆو رۆمان». جووڵەو حاڵەتی ئەسپەکان «هەرچەند لە بارێکی سەربازیدان» زیاد لە دەلالەت و هێمایەک هەڵدەگرن، پڕن لەبەخشش و داهێنان، هەموو هێمایەکان، هەموو جووڵەو هێڵەکان موتوربەن بەو ئەحساس و حاڵەتە کپە جنسییانەی لەناخی جیرتلەردان.

* * *

بێ گومان رەگە قوڵەکانی رۆمانی «ژنانی عاشق» لەناخ و هەستی

(لۆرانس)دا زۆر پێش دیتنی تابلۆی «گیژاوی ئەسپ» هەبوون، بەڵام ئەو تابلۆیە هزرو بیرکردنەوەی (لۆرانس) رادەتەکێنێ.

لەلایەک دڵەراوکێ ونیگەرانی داهێنەر، لەلایەک بیرو بۆچوونی (لۆرانس) بەرانبەر بەجوولەکەو لەوانیش «جیرتلەر» هەڵوەستەیەکی پێدەکەن، ئەوە جگە لەو بناغە هزری و دەروونی و حاڵەتە جنسییە هاوبەشانەی لەنێوانیاندا هەبووە.

بەڵگەشمان بۆ ئەوە ئەوەیە کە رۆمانی «ژنانی عاشق» جگە لەو شوێنەی بەقسەی لۆرانس خۆی راستەوخۆ سوودی لە تابلۆی «گیژاوی ئەسپ» و کەسایەتی (جیرتلەر) وەرگرتووە. سەرەڕای ئەو جێیە ئەوە لەسەر لەبەری رۆمانەکەدا ئەو بیرو بۆچوونە، ئەو جنس و توندڕەوی و گیژاوی ژنە وەک سێبەر لەدوای هەموو حاڵەتەکانەوە دیارە.

(ستراشی) دەنووسێ «لەکۆتای (١٩١٦) یا دوای دووساڵ لەشەڕی خەندەق لێدان و نوشستی هێرش لەوەرزی هاوین و پایزدا ئەو تابلۆیە هاتۆتە چێ کرن، تابلۆکەش وەک «ژنانی عاشق» کاردانەوەی تاڵی شەڕە» ل١٠٤ «تابلۆو رۆمان»

* * *

دەمویست لەو بوارەدا کەلێنێک وەبینم، هێڵە وردەکانی تێکەڵ بوونی هونەرەکان بۆ دەربڕین و جوانکاری لە کوردیشدا بخوێنینەوە. بەڵام ساوایی هەردوو بواری شێوەکاری و رۆمان دەرگایەکی بۆنەکردینەوە. هەرچەندە دەتوانین لە کلاو رۆژنەیەکی دیکەوە بچینە ژووری و ئەو کلتورو شارستانی و ئەفسانانە بدۆزینەوە کە کراون بەبابەتی داهێنان لە بواری ئەدەب و شێوەکاریدا بەشێوەیەکی هاوبەش وەک قەڵای دم دم و بەردەقارەمان و خەج و سیامەندو.... تا دەگاتە کارەساتی هەڵەبجە.

هەرچەندە کاملیش نەبن. ئەوە پرسیاری ئێستایە، داخۆ دەتوانین تاچەند توانا بڵاو و هەمەلایانەکانی شێوەکاری و مۆزیکاو شیعرو چیرۆک بۆ داهێنان و دەربڕین وەگەڕ خەین، هەرچەند شارستانییەت و

ڕۆشنبیری لەو دنیایە نزیکمان دەکاتەوە، بەڵام ئەوەشمان لەبیر ناچێ، کە تاکە کەس هەردەم ئەو دەرگایانەی کردۆتەوە، کێڵگەیەکی دیکەی بۆ پێگەیاندن و تێگەیشتنی کۆمەڵ ڕۆناوە.

* کتێبی «تابلۆو ڕۆمان» نووسینی (جیفری میرزە) (مەی موزەفەر) کردوویەتی بەعەرەبی.

# «دۆن کیشۆت»
# داستانی پاڵەوانی مانش

دۆن کیشۆت داستانی هەموو داستانەکان و داستانی مرۆ، زۆر لەوە ناسراوترە کە ئێمە لێرەدا کورتەیەکی بگێڕینەوە، هەرچەندە لە هەموو خوێندنەوەیەک فراوانترە یان دەشێ بەردەوام بخوێندرێتەوە، ئێمە هەوڵ دەدەین لە دەرگایەک بچینە ژوورێ تەنیا یەک کەسی پێداچێ.
بە چەند خاڵێک دەست پێدەکەین کە دەشێ تانوپۆی گشتیی داستانەکە بن.
١- پاڵەوانبازی و سوارچاکی: دەستوور و ڕێوڕەسمی پڕ شکۆو چەسپاوی نەجیبزادەکانی ئەوروپا بووە بەدرێژایی دەسەڵاتی فیودال و دواتریش.
بنەماکانی ئەو کەسایەتییە لەشێوەی ڕۆستەمی زاڵ و ئەمیر ئەرسەلان «بەچاو پۆشین لە وردەکارییەکان» گەیشتۆتە لای ئێمە. سەردەمانێکی درێژ ئەو ڕێوڕەسمە پڕ شکۆیە» بەپیرۆز ڕاگیراوەو نەکراوە سووکایەتی پێ بکرێ یان بکرێتە ئالیەتی دەربڕین و گاڵتەجاڕی.
٢- رووحی گاڵتە و نوکتە و گەمەکانی دیکەی هەرچەند سەربەخۆو بەتەنێ هێند بەهێزو گەرموگوڕن کە خوێنەر تادوا پلەی هەست و

فیداکاری و ویژدان کە نەک کەسەکانی دەوروبەری خۆی، بەڵکو تەواوی مرۆڤایەتی پێی پێدەکەنن، پێکەنینێکی پڕ شەرمەزاری و خەم.
دۆن کیشۆت کەسایەتییەکی ئاسایی یان شێت نییە تەنیا بۆ مەبەستی پێکەنین یان کات بەسەربردن دروست کرابێ، دۆن کیشۆت بێ مەبەست پەلاماری ئاشی باکان نادا، هەموو هەوڵێک بۆ گۆڕینی دنیا یان وەلانان و کۆتایی چەوسانەوەو زوڵم هیچ نییە جگە لە هێرشبردنە سەر ئاشەباکان. دۆن کیشۆت بە تەنیا جێی پێکەنین نییە، هەموو نووسەرانی دنیا بە تایبەتی ئەوانەی بەو نیازە کاردەکەن شتێک بگۆڕن جێگای پێکەنن. ئەوە «زەنگە» تائێستا مرۆڤایەتی گوێیەکی وای نییە ئەو زەنگە ببیستێ.

*　　　*　　　*

لە نیگایەکی دیکەوە بڕوانینە ئەو داستانە ناوازە، داستانی پاڵەوانی سیما خەماوی یان پاڵەوانی مانش، دەتوانین یان دەبینین زۆر لەو یاساو بنەمایانەی مرۆڤ دەپارێزن بە جاڕنامەی مرۆڤیشەوە لەو وەرگیراون. دیارترینی ئەوانەن:
– ئەی پاڵەوانی نامەرد. لە کەسێکی بێ بەرگری مەدە. دۆن کیشۆت ل٣٢ وشەی پاڵەوان نابینین و «نامەرد»یش تەنیا بۆ وەئاگاهێنانە، ئەوە دایەلۆگی سێرڤانتێس-ە لەگەڵ دنیایەک کە تەمەنێکی درێژی لە زیندان و چەرمەسەریدا بردۆتەسەر.
– باوەڕم وایە خودا، مرۆی بۆ ئازادی دروست کردووە نەک بۆ کۆیلەیی ل ٩٤ ئەوە گەوهەری ئازادیی دۆن کیشۆتە، سێرڤانتێس لە حاڵەتێکی کۆمیدی و نوکتە ئامێزدا لە بارێکدا بۆ خۆی لەوپەڕی بێهێزیی فیکرو جەستەدایە. زۆر بیریاری دیکە، ئەو وتەیەیان دووبارە و سەد بارە کردووەتەوە، لە حاڵەتی زۆر جددی و لە بارێکی زۆر بەهێزیاندا، بەڵام ئەنجام «تەنیا مرۆ بەکۆیلەیی مایەوە»
– مۆسیقا لە هەر کوێ بێ خراپەی لێ نابێل ل٢٠٣.

- یان خراپە لەڕووناکیدا نییە.
دەشێ سێرڤانتێس لەو بیریارە هەر سەرەتاییانە بێ کە لە گرنگیی مۆسیقا دواوە نەک هەر ئەوە، توانای مۆسیقا بۆ نەهێشتنی خراپە یان ئەو مێشکەی جێگای مۆسیقای تێدا بێ جێگای شەڕی تێدا نابێتەوە. وەک چۆن لە رووناکیدا جێگایەک بۆ تاریکی نییە ئەوەش گرنگی و پیرۆزیی ئاگرو زەردەشتمان بیر دەخاتەوە.
شێتی: لەو داستانەدا ناکرێ خۆ لە تێکەڵبوونی شێتی و عەقڵ ببوێری، عەقڵ و شێتییەک کە دوو دیوی دراوێکن و تا ئێستا لە هەوا دەسوورێن و بێهوودە چاوەڕێین بکەوێتە سەر زەویی یەکێکیان تاج لەسەرکا.
* پاڵەوانی سەرگەردان مافی ئەوەی هەیە بەبێ هیچ هۆیەک شێت بێت.ل١١١
* خودا لەو گوناهە گەورەیە لێت خۆش نابێ... دەتەوێ خۆشەویستترین شێتی جیهان عاقڵ بکەی. «دۆن کیشۆت».
* چما نازانی ئەوەندەی بەشێتی بە کەڵک دێ، بە عاقڵیی وانییە؟
* هیوادارم قەت دۆن کیشۆت چاک نەبێتەوە. تا شێتییەکەیمان لەدەست نەچێ. دۆن کیشۆت ل٢٣٩.
هەرچەندە زۆر لەوانەی لە دۆن کیشۆت دواون هەموو ئەو بوعدانەیان لەبەرچاو نەگرتووە کە نووسەر بە «شێتیی» بەخشیوە. کە هیچ دەلالەتێکیشی لەبەرچاو نەگیرێ، لە سادەترین حاڵەتدا ئەوە دەگەیەنێ.
«ئەو دنیایەی کە عاقڵەکان تێکیان داوە، دەبێ شێتێک رێکی بخاتەوە» لە کۆتاییدا هەرئەوەندە دەڵێم:
«وازهێنان لە قەڵغان و رمبی دۆن کیشۆت وازهێنانە لە «مەبدەئو بیرە سەرەکییەکانی مرۆڤ و تەسلیم بوونە بە جیهانی درۆو پڕ ریا»
دەست خۆشی بۆ کاکەوەیس و ئاوەدانی بۆ کتێبخانەی کوردی.

# گردی جودابوونەوە
# خوێندنەوەی فرمێسکەکانی شەڕ

زمانی هاوبەش، قسەی هاوبەش، بانگی هاوبەش، گریانی هاوبەشی مرۆ ئەو ئەدەبە ڕووحییەیە کە تەعبیر لە ناخ و هەستی بریندارو نیگەرانی بێ سنوورو چاوەڕوانی و ژیان و مردنی مرۆ دەکات. جا بەهەر زمانێک، بەهەر تەکنیکێک، بەهەر فۆرمێک بێ.

* شەڕو بزربوونی شەڕ پانتاییەکی فراوانی ئەدەبی سۆڤیێتی داگیرکردووە، ئەوەش هیچ جێگای سەرنج نییە ئەگەر بزانین ئەو وڵاتە لە شەڕی گەورەی دنیادا گەورەترین قوربانی داوە.

* (گردی جودابوونەوە) کتێبێکی ٨٠ لاپەڕەییە، کاک بەدران ئەحمەد کردویەتیە کوردی، حەوت چیرۆکی حەوت چیرۆکنووسی گرتۆتە خۆ. نزیکەی تەواوی چیرۆکەکان تاسەو برین و فرمێسکی بەجێماوی شەڕن. ئەو شەڕو خوێن و مردنانەی قەڵەم هەر چەند بەسەلیقە بێ گەڵا هەرە چوکەڵەکانی پێ خڕ ناکرێتەوە.

* ئەگەر لێدوان لەو چیرۆکانە (گەمە کردن بێ بەباڵی پەپوولە) دەبا ئێمە گەمە بەسێبەری باڵی ئەو پەپوولانە بکەین کە هەر لەشەڕ

کەوتوونەتەوە.

* گردی جودابوونەوە:- ئەگەر گردی جودابوونەوە. (یەکەم) چیرۆکی ڤاسیلی بیلۆڤ بێت، واتە ئەو چیرۆکە دوای کۆتایی هاتنی شەڕ بە هەژدە ساڵ نووسراوە، ئەوەش ئەگەر واتایەکی هەبێ ئەوەیە کە ڤاسیلی سەلیقەیەکی وردو بیرەوەرییەکی زیندووی هەبووە لەوەی کە کات نەبۆتە هۆی سڕینەوەی هەست و نەستە دەروونی و قووڵەکانی (ماریا).

* چیرۆکەکە سەرتاپا بە زمانێکی شیعری و هەناسەیەکی درێژ نووسراوە، هەموو ڕووداوو کەسایەتیەکان لە ماریادا بەرجەستە بوون.

گردی جودابوونەوەش وەک شوێن سێبەری بەسەر هەموو شتەکاندا، بەسەر هەموو کەسەکاندا هەتا ماریاشدا کێشاوەو هزرو بیری تەواو داپۆشیوە. ئەو گردە هەر لە سەرەتایەکی زۆر نزیکەوە لە ناونیشانەکەیەوە (ئەنجامێکی) دیارو ئامادە دەداتە خوێنەر، ئەویش (جودابوونەوەیە)، ئەویش هەموو واتاکانی لێک دابڕانە.

نووسەر لە بونیادی ڕواڵەتی چیرۆکەکەدا دەیەوێ زۆر بە پارێزو تەکنیکێکی شاراوە ڕووداوەکانی لە (هەواڵ) دووربخاتەوە و زمان بکاتە هەیکەلی ئەو دەربڕینە ئیستاتیکیە.

دوای (سێ سەد) ڕستەی چڕوپڕو ناسک ماریا دەڵێ:

**(نایەتەوە، نایەتەوە، هەرگیز، نەسبەی، نە دووسبەی، هەرگیز) ل١٦**

بێ گومان ئەو ڕستەیە بەتاڵ کردنەوەی چاوەڕوانی خوێنەرە، نووسەریش بە زۆر زانییەکی وردەوە خوێنەر بۆو ئەنجامە ڕادەکێشێ و لەو ماوەیەشدا ڕوحی خوێنەر شیعر ڕێژ دەکات، هەر وەک چۆن داخستنی هەموو دەرگاکانی دەروونی ماریایە.

* لە گۆشە نیگایەکی تەواو پێچەوانەوە، ئەگەر لە دەرگای زمان بچینە نێو دەلالەتەکانی چیرۆکەکە، هەر لە ناونیشانەکەیەوە بونیادی زمانی چیرۆکەکە ئاشکرا دەبێ و سڕی چاوەڕوانیەکە لە بەریەک هەڵدەوەشێ.

تەنها قووت بوونەوەی وشەی (جیابوونەوە) خوێنەر دەگەیەنێتە ئەو

ئەنجامەی نووسەر دوای سێ سەد دێر ئاشکرای دەکات. ئەوەش ئەنجامێکی دوولایەنی لێدەکەوێتەوە.
**یەکەم:** لە لایەک دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ڕەونەق و حەسرەتێک لە وشەی گردی (جودابوونەوە)دا نووسەری فریوداوەو ئەو ئاپارتمانەی بە زیاتر لە سێ سەد دێر هەڵیچنیوە، (بێ ئاگای) نووسەر ئەو وشە ئەو گردە ئەو ئاپارتمانە سیحرییەی بن کۆڵ کردووە.
**دووەم:** لە لایەکی دیکە هەر ئەو (نێو نیشانە) ئەوەمان لا ئاشکرا دەکات کە نووسەر بە ئاگاییەکی (تەواوەوە) ویستویەتی وا لە خوێنەر بکات چاوەڕوانی هیچ (نهێنییەک) نەکات، ئەو تەنها بەهێزی زمانێکی شیعری کارەساتێک و دەروونی (ماریا) والا دەکات و تەنها ئەو سیحرەش خوێنەر تا دوا وشە ڕادەکێشێ.
* نووسەر دەیەوێت تەواو چیرۆکێکی واقیعی بنووسێ بەتایبەت لە لێکدانەوەو تەفسیر کردنی ڕووداوەکاندا، (بێ لەو توانا بێ سنوورەی لەو بوارەدا هەیەتی)، ماریای وەک مرۆڤێکی نەزەر کردەو پیرۆز وێنە کردووە، پاکانەی هەموو ئەو شتانەی بۆ دەکات کە وەک (بوونەوەرێک) دەبوو دەگەڵ (پاڤێل) بیانکات.
ئەوەش (هەرچەندە دوورکەوتنەوەیە لە ڕێبازی واقیعی خۆی) تەنها بۆ ڕازی کردنی ئەو نەوە جەرگ سوتاوەیە کە دوای شەڕ هەستیان کرد چ زیانێکیان کردووە. جگە لە وڵاتی وێران، دەروونێک و عومرێکی وێرانیان بۆ ماوەتەوە.
جا نووسەر بەو دەسەڵاتە چووکەڵەی (وەک ئەندامێکی کۆمەڵ) هەیەتی تەنها دەیەوێت شەرەفی (پاکی) نەزەر کردەییان بداتێ. بەو نیازەی ببێتە پارسەنگێکی چووکەڵە (وەهمی) بۆ ژیانی لە دەست چوویان).
* ماریا وەدەزانێ مێردەکەی تەنها **(دوومانگی پێدەچێ ل١٣) بەڵام ئەوەتا- (بیست و پێنج هاوینی تەواو کلۆپێکورە بەسەر گیاو گوڵدا کەڵەمبازی داو، (شنگ)ی بەرز و بڵند بۆ بیست و پێنجەمین جار زەرد**

**بوو؟) ل٩**

ئەو بیست و پێنج ساڵەی ماریای لە بۆشای چاوەڕوانیدا تواندەوە، ئەوەتا ماریا لە سەرەنجامی ئەو کارەساتەدا ڕووح و هەستی خوێنەر وەبەر سوژن دەداو دەڵێ:

**- (ئای دەستی سپیم شل و شۆڕ بوون، چاوی ڕوونم لێڵاییان داهات، ڕوومەتی سپیم ڕەنگی مردنی لێ نیشت، هەموو لە سۆنگەی ئەو کۆستە گەورەیەم تۆ ڕۆیشتی وەک سەربازێک بەرگری بکەی.) ل١٢**

* ئەوەی دەنێو هەموو ئەدەبی دنیا، ئەدەبی سۆڤێتی جیادەکاتەوە ئەو ڕووحە پڕ بەرگری و قوربانی دانەیە کەوا لە کەسانی خەڵکی نەتەوەکانی دیکەش دەکات سۆزیان بڕژێ و دەگەڵ پاڵەوان و مەسەلەکانیان وەکوڵ بێن.

پێش ئەوەی ماریا ئەو هەستە دەربڕێ ئێمە لەودیو وشەکانەوە ئەو هەست و فرمێسکانە دەبینین و لە پیرێژنی کۆست کەوتوی کوردەوە دەیانناسینەوە.

* (ماریا) سەرەڕای عومرێک چاوەڕوانی بێ هودەو توانەوەی مۆمی تەمەنی هەست بە شەرمەزاری دەکات بەرانبەر مێردەکەی چونکە ماوەیەکە سەری بەو شوێنە دانەکردووە کە لەوێ لێک جیا بوونەوە. ئەو شوێنە ئەگەر لە سەرەتادا وەک دوا ژوانگە بێتە بەرچاو دواتر دەبێتە گۆڕی بزری مێردەکەی. ئەو مێردەی کە قەت بیری لەوە نەکردۆتەوە مردووەو **(پێی وابوو هەر زیندووە) ل١٠**

* هەر ئەو بیرەشیەتی وای لێدەکا هێندە بە توندی داواکاری پاڤێل ڕەتکاتەوە، **(پاڤێل گەنج بوو، کە شەڕ تەواو بوو، ڕۆژێکیان هات و بە ڕاشکاوی داوای شوویێ کردنی لێ کرد. ل١٤**

پاڤێل (ئامۆزای مێردەکەی) دەزانێ بزر بوون لەشەڕ مانای چی، ئەوەش دەزانێ کە دنیا لە گوندەکەی ئەوان کۆتایی نایەت و ژیان بە کەسێکەوە نەبەستراوەتەوە، مرۆ دەبێ ئەوەندە ورەی هەبێ هەناسە

بدات، ژیان ناوەستێ و نەک مرۆ دارو بەرد، گاو ئاو لە جوولەدان، ئەوەتا جوانترین وەسفی واقیعی و پڕ ڕۆمانسیەت و حەسرەت لەسەر زمانی ماریا.

**- (خەلکی دێنەوە پووش بڕین، گا دەقۆڕێن و کتلی دێنەوە کوڵ تەنیا ئەو نایەتەوە ل۱۷)**

سەرەڕای ئەو ڕاستییە بزرانەی دەروونی ماریا هەر لە ڕۆژانی مێردەکەیدا دەژیاو ڕاستیەکانی نەدەبینی یان نەیدەویست بیانبینێ. لە وەلامی پاڤێلدا.

**(تفێکی لە چاوی پاڤێل کرد.) ل١٤**

* کچەکەی بوونێکی سەربەخۆ لای خوێنەر دروست ناکا، هەر زوو بنەمایەکمان لا دروست دەکات کە کۆتایی چیرۆکەکە تێکەڵ بوونی ئەو دوو کەسیەتیەیە، یان کچەکە جەستەیەکی ئامادەیە بۆ خۆشاردنەوەی ماریا تێیدا.

* * *

## زەنگی مردن یان زەنگی کۆتایی

کچەکەی ماریا تاکە کەسیەتە ڕایەڵی نێوان ماریاو مێردەکەی پێک دەهێنێ دوای گردی جودابوونەوە.

وەختێک هەست بە بوونی کەسێک دەکات لەگەڵ کچەکەی دەپرسێ.

- کێیە لەوێ لەگەڵ کچەکەم؟ ئەوەش ترس و سامێکی قورسی لا دروست دەکات و خۆی بێ دەرەتان و دەستە پاچە دەبینێ. وەختێک دەرگای هیوایەکی بە ڕووداناکرێتەوە، تەسلیمی ئەو واقیعە دەبێ کە سەرەڕای هەموو تالی و کەسەرێک، شتێکی تێدا هەیە. جوانیەک لە گۆڕێ ماوە، ئەویش کچەکەیەتی.

**- (کچەکەم بەو زووانە دەبێتە بووک.. کچەکەم بووکە، ئای گیان.. گیان.. ئەو ماوە دوورو درێژە هەمووی ئەو فرمێسکە ڕژا.. ل١٦)**

کچەکەی ئەو گولەیە، ئەو بەهارەیە وای لێدەکات پایزی تەمەن و

مردنی مێردەکەی ببینێ و هەست بکات هەموو شتێ تەواو، چونکە دەزانێ:-

**- ئیدی هاتوو چۆی گردی جودابوونەوەش داد نادات. بیست و پێنج ساڵ لە چاوەڕوانی ئەو، چاوەڕوانی خۆشەویستترین کەس، ئەویش هەموو ئەو ساڵانە لە گۆڕی خۆی لە وڵاتی بیانیدا ڕاکشاوە. ل١٧**

* بۆ ساتێکی کەم هەست بەو ڕاستیە دەکات، هەر چاوتروکانێک بەرگەی ئەو ڕاستیە دەگرێ. چونکە دەروونی بە چاوەڕوانی گەمارۆ دراوە، ناخی دەروونی بەو شتە وەهمیانە گمارۆ دراوە کە هانیان داوە ژیان بەرێتە سەر، چونکە ئەو شتانە هێندەی نان بۆ ژیانی ماریاو نەوەی جەنگ پێویستن.

* دیسانەوە وەسیلەیەکی دیکەی دەوێ بۆ ئەوەی ژیان پەرە پێ بدا، وەک هونەرمەندێ ژیانی خۆی، بوونی خۆی لە کچەکەیدا دەبینێ، دوای ئەوەی لە کچەکەی و سێرگی مێرد منداڵ ڕادەمێنێ هەست دەکات.

**- (جاحێلە و سەر لە نوێ لە دایک بۆوەتەوە، نەخێر ماریا نەبوو بووبە بێوەژن نە هیچ ڕۆژێک و نەهیچ هەفتەیەک.) ل١٧**

* * *

* لە خوێندنەوەیەکی دیکەی چیرۆکەکەدا، بەدەر لە ڕێبازو بونیادی تەکنیکی، دەتوانرێ خوێندنەوەیەک تەنها بۆ هەیکەلی زمان بکرێ، چونکە زمان بایەخێکی سەرەکی پێدراوەو پانتاییەکی فراوانی داگیرکردووە، جیا لە واتای سینتاکسی ڕستەکان، جیا لەو مانا ڕووتانەی وشەو ڕستەکان هەڵیانگرتوون. هەیکەلێکی پتەو بۆ دیوی نەدیوی زمان کراوە.

ئەگەر تەنها وشەی (پووش) وەرگرین کە بۆتە هەوێن و سەرە داو و ئێکسسواری گشتگیری فەزای چیرۆکەکە، پێویست دەکات هەموو ئەو دەلالەتانە شیکەینەوە کە لە دوای (پووش) خڕ دەبنەوە دوای جوڵانی سەراو دەکەون. پووش وەک:

**١- ڕەنگ (زەرد) ٢- نیشانەی پایز ٣- سووکی ٤- بێ بایەخی**

جگه له هه‌موو ئه‌و ده‌لاله‌تانه‌ی له نێـو ئیـدیۆمـدا ده‌یانبه‌خشێ.
سه‌ره‌تای چیرۆکه‌که به پووش و فه‌زایه‌ک له نیگه‌رانی و مه‌لولی ده‌ست پێده‌کات.
کۆتایی چیرۆکه‌که دیسان به ترس و فه‌زایه‌کی خه‌مبارو ئاماده‌یی پووش دێت؟

**(ئیدی لوتکه‌ی کۆمه‌له پووشه‌کان ده‌تکوت به‌سه‌ر زه‌ریایه‌ک شیری ڕه‌نگ بۆزی ته‌مـه‌وه مـه‌له ده‌کـه‌ن.. تاوێکیش کـۆڕ ژنی به‌سـۆزی جوانووه‌ماینی له ترسا تاساوی به شه‌ونم ته‌ڕ بوو ده‌هات) ل١٨**

* جگه له (پووش) گـردی جـودابوونه‌وه یان هه‌ر جـودابوونه‌وه‌یه‌ک وه‌ک یه‌کـه‌یه‌کی زمـان به‌کـار بردنێکی چه‌ند لایه‌نی هه‌یه، کـه ده‌کرێ ته‌نها له‌و ده‌رگایه‌وه بچینه فه‌زایه‌کی دیکه‌ی ڤاسیلی بیلۆڤ.

(زۆر له مێژبوو یه‌که‌مین کلاو کوڕه به ئاسمانی گردی جودابوونه‌وه‌دا هه‌ڵفڕیبوو.)

بێ سه‌مه‌ر نابێ که له بونیادی زمانـی ئه‌و ڕسته‌دا شوێن کارێک له ئیسـتـاتیکاو مانا هه‌ڵێنجین به پشت به‌ستن به هه‌مـوو مه‌دلوله‌کـانی (جودابوونه‌وه)

. یه‌که‌مین: یه‌ک که‌س، یه‌ک مێرد
. کـلاو کـوڕه: نیـشـانه‌یه‌ک بۆ زیندوییی و ژیان جگه له گـرێ دانی هه‌ردوو وشه‌ی کلاو کوڕ
. هه‌ڵفـڕیبـوو: له ده‌ست چووبوو یان حـاڵه‌تێک له‌وه گـه‌وره‌تره یان ته‌ماویتر.

هه‌موو ئه‌وانه‌ش له فه‌زایه‌ک له جـوودابوونه‌وه. هێنده‌ی گـردێک یان گردێک له جوودابوونه‌وه.

له لێکدانه‌وه‌ی ئه‌و ڕسـتـانه، یان لێک هه‌ڵوه‌شـاندنیـان وه‌ک یه‌کـه‌یه‌کی زمـان.. جیـا له بابه‌تی چیـرۆکـه‌که- ده‌شێ والا کـردن یان ئاشکرا کـردنی ته‌واو ئه‌و مـاناو ده‌لاله‌تانه بێ کـه چیـرۆکنووس مـه‌به‌سـتیـه‌تی. ئه‌و ڕسـتـانه‌ی کـه ته‌وه‌ره‌ی یه‌کـه‌میـان گـردی

جودابرونەوەیە.

**. گریەو ناڵەی دێوو درنجی لە گردی جودابوونەوە دەهاتە گوێ) ل١٣**

**. ئاسمتومانێکی بۆزو تاریک لە گردی جودابوونەوە دەناڵا.) ل١٣**

**. هەمـوو بایەک هەڵیـان کـردە سـەر گـردی جـودابوونەوە.) ل١٣ ...**

**هتد....**

لە لێکدانەوەیەکی ئاوا کە یەکەی زمان و پەیکەری ئاشکراو نەگۆڕی زمـان دەکـاتە تەوەری خـۆی چ پێـویست بەوە نـامـێنێ بزانین داخـۆ چیـرۆکنووس پەیرەوی کـام ڕێبـازی کـردووە، چونکە ئەو دەلالەت و جیـ انگیریەی زمان وەک دەسەڵاتی باڵاو تاک ڕەهەندی دروستیـان دەکات لە هەموو قوتابخانەو ڕێڕەوێک گەورەترە.

* وەرگێڕانی ئەو زمانە وردو سیـحری و قـورسە لە هەمان کات سادە توانایەکی دوو سەرەی گەرەکە، کە وەرگێڕ سەرکەوتنێکی چاکی تێدا بەدەست هێناوە کەچ نەبێ لە بونیـادنانی ڕستە کوردیەکان بەو سەلیقە وردو هەست ناسک و شیعریەوە.

* ئەوەی ماوە بیلێین ئەوەیە، ئێمە لێرەدا تەنها لە چیرۆکی (گردی جـودابوونەوەی) ڤـاسیلی بیلۆڤ دواویـن، چاوپۆشین لە چیـرۆکـەکـانی دیکە بەتـایبـەتی (هەزار ولا)ی (نۆدار دومـبـادزێ) کـە دەسـەڵاتی هەمەلایەنی چیرۆکنووس دەستە باڵایە، لەگەڵ (سێوە سوورەی) جنگیز ئێـتـمـانۆڤـدا بە خـەتا دەزانین و هیـوادارین لە داهاتوودا ئەو قـەرزە بدەینەوە.

# شانۆی ماتەمی ئێرانی
## وەک نموونەیەک بۆ شەڕی شارستانیەتیەکان

کتێبی «التفسیر والتفکیك والایدیولوجیة» یەکێکە لە کتێبە پڕ بایەخەکانی دیراسات و لێکۆڵینەوە، چەندان نووسەرو بیریار تێیدا بەشدارن، لەوانە «بیتەر بروک، تیری ئەنجلتون و سو. ئالین کیس. بیتەر فوللرو چەندانی دیکە. ئەو نووسەرانە لە ئاراستەکردنی ئاستەکانی لێکۆڵینەوەو تەکنیک و ئالیەتی نووسین شوێن دەستیان دیارە.

لێدوان لەو کتێبە، لێدوانە لە زووربەی کایەکانی رۆشنبیری، لێدوانە لە بابەتە جیاوازەکانی فیکر، سەرەتا دەکرێ بابەتەکان وەک چۆن لە کتێبەکەدا هاتوون ریزبەند بکەین:

* کێشەی بەهای هونەر: گفتوگۆی نێوان رەخنەگری ئەدەبی تیری ئەنجلتون و رەخنەگری هونەری بیتەر فوللر و جەماوەر.

* لە کتێبی راڤە، هەڵوەشانەوە، ئایدیۆلۆجیا. نووسینی کریستۆفەر باتلەر.

* تێڕوانینێکی تەقلیدی بو مێژووی شانۆ. خوێندنەوەیەکی هەڵوەشانەوە «تەفکیکی» لەبیری ژنەوە. لەکتێبی ژن و شانۆ. نووسینی سو. ئالین کیس-ەوە وەرگیراوە.

* دەربارەی شانۆی ژن. لێکۆڵینەوەیەک بە قەڵەمی سوزان. أ. باسنیت ماجواید
* کاتێک ئافرەت بۆ شانۆ دەنووسێ. لێکۆڵینەوەیەکە بە قەڵەمی میشلین و ئاندور.
* لەبارەی شانۆی گەلی-یەوە: ئاریان منوشکین و شانۆی رۆژ
* خۆشەویستی و مردن. لە نوێترین ئەزموونی ئاریان منوشکین لە شانۆی رۆژدا.
* سیمای تەعزیەی ئێرانی. لێکۆڵینەوەیەکی سیومیۆلۆژییە. بە قەڵەمی ئاندریە فیرث
* ئەزموونگەری لە شانۆی پۆڵەندی.
ئەو بابەتەی دوایی مەلەفێکی تەواوە لەسەر شانۆی پۆڵەندی- شەش بابەتی جیاوازی زیاتر لە شەش نووسەری گرتۆتە خۆی.

* * *

من تەنیا لەسەر یەک بابەتیان دەدوێم ئەویش:
* سیمای ماتەمی ئێرانی. بەقەڵەمی ئاندریە ڤیرث.
وەرگێڕی ئەو وتارە «نوهاد صلیحة» پێشەکییەکی بەپێزی بۆ نووسیوە، تێیدا دەڵێت:
«تەعزیە یان ماتەم لە ئێران گەشەی کردو بووە شێوەیەک لەشانۆی ئاهەنگسازی، ئەویش یادکردنەوەو بەزیندوو راگرتنی شەهید بوونی ئیمامی حوسێن-ە لە کەربەلا لە «١٠»ی موحەڕەمی ساڵی (٦١)ی کۆچی واتا (٦٨٠)ی زایینی».
دروست بوونی ماتەم لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی دوو جۆرە تەقسی دینی گەلی دروست بوو.
یەکەمیان: رژانە سەر جادەی خەڵک و سووڕانەوەیان بە جادەو کۆڵانەکانی شارو پایتەختەکانی شیعەکاندا. ئەوەش لە سەدەی حەوتەمی زایینی دەستی پێکرد.
دووەمیان: شێوەی دووەمی ئەو ئاهنگانە، لەسەدەی شازدە دەستی

پێکرد، ئەویش بەگێڕانەوەی ژیانی ئیمام حوسێن و خێزانەکەی لەنێو کۆمەڵە شیعییەکاندا.

حیکایەتخوان لە جێگایەکی بەرز دادەنیشت و بەشەکانی کتێبی «باخچەی شەهیدان»ی بۆ گوێگرەکان دەخوێندەوە.

* لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمدا، ئەو دوو جۆرە ئاهەنگە دینییە تێکەڵ بوون، تەعزیە بەشێوەی شانۆ دەرکەوت.

* سەرەڕای ئەو سیما دینییەی بەو جۆرە شانۆ یان ئاهەنگانەوە نووساوە، بەڵام لێکۆڵەرەوەکان و بیریارەکان لەوە یەک دڵن کە ئەوە تەنیا باوەڕێکی دینی نییە، بەڵکو ڕۆشنبیرییەکی نەتەوەیی درێژو کەڵەکەبووی لەدوایە.

مەبەستیان لێرە «تێکەڵ بوونی بیری ئیسلامیی شیعەیە لەگەڵ کولتووری فارسی کۆن» ناکرێ ئەو زانیاری و بیروڕایانە «کە تەواو لەجێگای خۆیاندان» هەروا تێپەڕن، ئێمەش وەکو کورد لە یەکێک لەدیوەکان لە سەردەمێکدا خاوەنی هەمان موعاناتی فارس بووین و هەین. ئەوەش ئەو غەریبییەیە کە کەسێک یان نەتەوەیەک لە «دینێکدا» هەستی پێ دەکات کە ئەو دینە هەیمەنەی نەتەوەیەکی باڵا دەستی بەسەردا زاڵە یان لەناخی فەرهەنگ و کولتووری نەتەوەیەکی دیکە هەستاوەتە پێ، واتا زاڵ بوونی فەرهەنگێک بەسەر دینی باوەدا واتا زاڵ بوونی نەتەوەیەک بەسەر ئەوانی دیکەدا.

فارس لە جوانترین شێوەدا، ئەو «غەریبییەی» خۆیان کوشت، ئەو کوشتنە بووە وێنەو سیمای فارس لەسەر جادەو نێو کۆڵانەکان و حەوشەی تەکیەکان.

* فارسەکان توانییان شەهیدبوونی ئیمامی حوسێن بۆ پاراستنی کولتووری خۆیان بەکاربێنن، ئەوان بوونە میراتگری خوێنی حوسێن، ئیمامی حوسێن وەکو زوڵم لێکراوێک وەکو شەهیدێکی موقەدەس سۆزو خۆشەویستیی بەشی هەرە زۆری موسڵمانانی ڕاکێشا، فارسەکان توانییان ئەوسۆز وخۆشەویستییە بهێننە نێو کولتووری خۆیان و

خۆشەویستی بۆ حوسێن و خۆشەویستی بۆ فارس بکەنە یەک.
ئەوە کولتووری فارس یان ئێرانییە لە شەقامەکانی کەربەلادا دەگری، ئەوە رووحیەتی ئەو شارستانیەیە بۆ شەهیدی موقەدەسی بیابانەکانی بەسرەو عەمارەو ناسریە دەبرێ و بەرەو کەربەلا دێت.
* فارسەکان توانییان بەهۆی فەرهەنگی کەڵەکەبوویان ئەو غەریبییەی خۆیان بگۆڕن بە «ماتەم» ماتەمێک کە دواتر بەشی هەرە زۆری ئیسلامی گرتەوەو دەکرێ ئەوکارلێکردنە وەک بەشێک لە «شەڕی شارستانیەتەکان» تەماشا بکرێ.
شەڕی فەرهەنگی ئێرانی و فەرهەنگی دوورگەی عەرەب کە دواتر تێکەڵییەک دروست بوو کە هەردووکیان بەهی خۆیانی دەزانن وهی هیچیشیان نییە.
* لە مانگی ئابی ساڵی (١٩٧٦)دا، کۆنگرەیەکی نێو دەوڵەتی لەشاری شیراز لەسەر «ماتەمی ئێرانی» گیرا. لە بڕیاری گێڕانی ئەو کۆبوونەوەیەی ساڵانەدا، ساڵی (١٩٧٩) زانکۆی نیویۆرک ئەو لێکۆڵینەوانەی لە مهرەجانی ئەوساڵەدا پێشکەش کران بە ناونیشانی «ماتەمی ئێرانی لەنێوان تەقس و درامادا» بڵاوکردنەوە.
«Semiological Aspects Of the Taziyeh»
«Taziyeh: Ritnal and Dram in Iran»
ئەو کتێبە بە قەڵەمی بیتەر. جەی. چیلکۆڤسکی نووسراوە
لێکۆڵینەوەکەی ئاندریە فیرث کە لەسەر ئەو نووسینەی سەرەوە نووسراوە، رەگوریشەی شانۆی ماتەمی ئێرانی خوێندۆتەوە. بۆ تێگەیشتنە لە ئاندریە فیرث سەرەتا دەبێ زاراوەو کلیل و هێماکانی تێبگەین، چونکە بەپێی تێگەیشتن لەو زاراوانە ناتوانرێ لە گرنگی ئەو وتارە بگەین.
ئەو لێکۆڵینەوەیە، شیکردنەوەیەکی سیمیۆلۆژییە، یەکێک لە دیارترین و سادەترین زاراوەکانی «العلامة» یان دیاردە یان نیشانە بەڕای من «عەلامە» بۆ خۆی مانایەکە باشتر دەگەیەنێ.

* عەلامە: لە سادەترین تەعریفیدا ئەو شێوەیە یان ئەو شکڵەیە یان شتێکی هەست پێکراوە کە دەبێتە هۆی دروست بوونی واتا لە زهنی وەرگر یان (ئەوی دیکەدا).. هەموو دراوە مەوجوودەکان کە هەستیان پێ دەکرێ، دەشێ بینە «عەلامە» کاتێک لە چوارچێوەیەکدا رێکدەخرێن و بە دەلالەتێکی دیاری کراو رەنگ دەکرێن. ئەوە سەرەڕای جۆرەکانی «عەلامە» فیرث زاراوەی «زمانی وەسفی» (Meta- lan-guage)یان زمانی بابەتی (Object- language).

* نووسەر لەو لێکۆڵینەوەیەدا، هیچ زاراوەیەک یان ئالیەتێکی باوی بەکار نەهێناوە بۆ تێگەیشتن لە ماتەمی ئێرانی کە ئەو پێی دەڵێ «ئۆپرای دینی و جەماوەری ئێران» لەو باوەڕەدایە کە پشت بەستن بە «زارەی درامی «أرسطي» تەنیا زیاتر راستیمان لێ دەشێوێنێ. مەبەستی نووسەر لە زاراوەی «الأرسطية» ئەوانەیە کە لە نووسینەکانیاندا پشت بە «سەرەتا و کۆتایی و ناوەرۆک و رووداو...» دەبەستن بەبێ ئەوەی لە وردەکارییەکان و سیماو جیاوازییە میکانیکییەکانی بدوێن.

* ئەو لێکۆڵینەوەیە سەرەتایەکی پتەوە بۆ دروست کردنی پایەکانی شانۆی رۆژهەڵاتی هاوبەش بەبێ گەڕانەوە بۆ تایبەتییەکانی رۆژئاوا.

لێرەشەوە من جارێکی دیکە دەگەڕێمەوە سەر شکاندنی بیری بە رۆژئاواکردنی فیکرو شێوەی نووسین و ژیانمان، بۆ ئەوەش دەگەڕێمەوە لای ئەندریە فیرث، وەختێک ئەوە دەسەلمێنێ کە «شانۆی ماتەم» لەگەڵ «جیهانی تەختەی شانۆ»دا بەراورد ناکرێ وەک ئەو شانۆیانەی پشت بەحیوار دەبەستن لە فەرهەنگی رۆژئاوادا، بەڵکو شانۆی ماتەمی ئێرانی تەختەی شانۆ بەجێ دەهێڵێ و بۆ ئەوەی هۆڵی پیشاندان و بینەران بگرێتەوە.

* لە شانۆی ماتەمەمی ئێرانیدا، گوتاری شانۆ لەسەر بنەمایەکی فەلسەفی- دینی وەستاوە، ئەویش بیرو باوەڕی شیعەگەرییەو لەسەر بنەمای جوانی ئەویش جوانییەکانی هونەری گەلییە «شەعبی»

* بونیەی گوتاری شانۆی ماتەم بەشێوەیەکی سیمیولۆژی «Semiology» بەکارکردن بە ئالیەتەکانی ئەو ڕێبازە. سیستەمی پێوەندی، پشت بە دوو کۆد دەبەستێ.

- کۆدی گوێ لێبوون و دیتن.

- کۆدی دیتن و ئیدراک.

کۆدی یەکەم شێوەی پێشکەشکردن و نواندن دیاری دەکات، بەڵام کۆدی دووەم، شێوەی دیتن و ڕەنگدانەوەی پیشان دەدات.

- لە سیستەمی پێوەندیدا «تەماشاکەر/ خاوەن باوەڕ» بۆ خۆی لە کرداری گێڕانەوەدا بەشدار دەبێت. تێکەڵ بوون وکارتێککردنی ئەو دوو کۆدە ڕووی دیاری شانۆی ماتەمە.

* بۆیە بەشێوەیەکی سروشتی دابەشکردنی ڕۆڵەکان بەحسێکی کاریگەرەو دەکرێ و پشت بەسروشتی دەنگ و چینەکانی دەبەستێ، ئەویش بە دەوری خۆی کار لە کۆدی ئیدراک دەکات، چونکە هەر دەنگێک لە دەنگەکان، دەلالەتێکی ئەخلاقی هەڵدەگرێ.

دەنگی ڕوون وبێ گەرد لە چینی بەرز کەسایەتیی چاکە دیاری دەکات، لە کاتێکدا کەسیەتیی شەڕانگێز بە دەنگێکی قووڵ و چینی نزم دەردەبڕدرێ.

* لە گوتاری شانۆی ماتەم بەسروشتی خۆی شتێک نییە بەناوی- ماوەی دراما- رابردوو لە پێشکەشکردنی ماتەمدا تێکەڵ ئێستاو داهاتوو دەبێ.

* هەر بەهەمان شێوە- شوێن- ماهیەتی خۆی ون دەکات.

* لە شانۆی ماتەمدا، حبکة- Plot شێوەیەکی گێڕانەوەی نیێە. ماتەم حیکایەتێک بەشێوەی زنجیرە ناگێڕێتەوە: تەنیا تەنسیق لەنێوان ڕەگەزەکانی نمایشدا دەکات.

* جیاوازیی گوتاری شانۆ یان شانۆی گوتار لەگەڵ حیواری درامی یان درامای حیواردا ئەوەیە کە لە حیواری درامی، بەشێوەیەکی بەرچاو هەست بە گۆڕینەوەی زانیاری دەکەی لەنێوان ئەکتەرەکاندا. لەکاتێکدا

ئەوە لەشانۆی گوتاردا نییە، بەڵکو ئەو، لەسەرەتاوە هەوڵی جووڵاندنی ئەو بیروباوەڕو فیکرانە دەدات کە گوێگر هەیەتی.

* ئەوەی شانۆی تەعزیەی ئێرانیش مەبەستیەتی کە تەماشاکەرو پێشکەشکاران لەسەری کۆکن «پیرۆزیی ئیمامە.»

* هونەری نواندن لە شانۆی ماتەمدا «پێشکەشکار و خاوەن باوەڕ» هیچیان دەورێکی درامی نابینن. کەسایەتیی دراما لە کۆدی «شفرە» بینین و بیستن دروست نابێ، بەڵکو ئەو کەسایەتییانە دەژین لە یادەوەریی تەماشاکەردا و لە بیروباوەڕیدا.

* «رۆلان بارت» لە «Hill and wang» ساڵی (١٩٧٤) وەسفی دەقی ئەدەبی بەوە دەکات کە «مافوورێکە لە کۆد درێژبۆتەوە». لەسەر ئەو قسەیە دەتوانین بڵێین کە «ماتەمی ئێرانی بەرەی فارسییە بە کۆدی جیاواز. کاتێک ئەو کۆدانە کارلێکدەکەن گوتاری شانۆ ژیانی تێدەگەڕێ.

* لێکچوونێکی زۆرگرنگ هەیە لەنێوانی شانۆی کلاسیک «Classic Theatre» و شانۆی ماتەم، ئەویش جووڵان و جۆشانی بینەرە بەو رادەیەی کە بینەر دەبێتە بەشێک لە کەسایەتیی شانۆ، ئەوەش جۆرێکە لە هەوڵدان بۆ خۆپاکردنەوە Self- Puration و چارەسەرێکی دەروونیشە

* تێکەڵ بوونی دەرهێنەر وەک کردەیەکی دیار، لەگەڵ جەماوەردا، سنگ کوتان و بانگ و لاوانەوەیەکی یەک نەوا و گریانێکی بە ئیقاع ئەوەش دەبێتە رەمزێکی (Meta- Language)یان عەلامەتی میتاشانۆ. هەر زوو دەبێ بەرەمز لەسەر ئاستی ئیشارەت کاتێک ئەکتەرەکانیش دەست دەکەن بەسنگ کوتان بە هەمان نەوا. دواتر سنگ کوتانی تەماشا کەران کە دەبێتە سیفەتێکی دینداری و ئیمانیی راستەقینە.

* جارێکی دیکە ئەونزیک بوونەوەیە لەنێوان زمانی وەسفی و زمانی ئیشارەتدا دەبینین لەنێوان دابەشکردنی گەنم وتۆو بەسەر

تەماشاکەراندا- گەنم لێرە وەزیفەی رەمزێکی وەسفکەری هەیە Meta- Symbol لە لایەک رەمز بۆ ئەو گەمارۆیەی لەسەر ئیمامی حوسێن و خێزانی بوو، لەلایەکی دیکەوە رەمز بۆ یەکبوون و یەکڕیزی «التوحید» نمایشکاران و جەماوەر لە تەقسێکی دینیدا.

* زۆرن ئەوانەی شانۆی ماتەمیان کردۆتە ئینگلیزی، بەڵام ئەندیە فیرث پشتی بەو کتێبە بەستووە.

- Sir Lewis pelly, The Miracle Play of Hasan and Husainn

# تارمایی مارت له بەرائەتی ترسدا

* «تارمایی مارت» وەک نۆبەرەی شانۆی سوێدی، نووسەری دووره وڵات بەڕێز «کوردو گەلاڵی» کردوویەتییە کوردی، بنکەی چاپی ئازاد لە سوێد بڵاوی کردۆتەوە.

* نووسەری ئەم شانۆنامەیە «ستیگ داگەرمان» لە (٥)ی تشرینی یەکەمی (١٩٢٣)دا لە سوێد لە دایک بووە، نووسەر لە ژیان و لە نووسیندا هەڵگری فەلسەفەیەک بووە، کاریشی بۆ کرووە، ئەو فەلسەفەیەی کە چ نەبێ لەو شانۆیەدا شەقڵێکی تەواوی وەرگرتووە، ئەو فەلسەفەیەی زۆر بەزەحمەت زمانێکی بۆ دەربڕین بۆ دیوەتەوە، هەڵتەکاندنی ئەو دیوارە دزێوو نەریتە قورسانەیەکە ئازایەتی و پاڵەوانێتییان لەسەر رۆنراوە، ئەو فەلسەفەیەی لاپەڕەکانی ترسنۆکی و بێ هێزی واڵا دەکات، ئەو ترسنۆکی و بێ هێزییەی لە باخچەکانی بەرائەت و مێرگەکانی جوانی دەکەونە سەر پێ.

* * *

لە مێژووی نوێدا شکسپیر یەکەم کەسە «تارمایی» وەک کەسێتییەکی کامڵ و سەربەخۆ بەکاربردووە، ئەویش لە شانۆی هەرە بەناوبانگی دنیا، لە شانۆی هەموو زەمەنەکان (هاملێت)دا هەر لە هەوەڵ دیمەندا تارمایی شا، بابی هاملێت، سەرەتا وەک مەتەڵ و دوایەش وەک کلیل و لە کۆتاییشدا وەک کێشەی زیندووی شانۆ

دەرددەکەوێت.

* نووسەری گەورەمان «داگەرمان» لە ژیانی خۆیدا لەوە سەرسامە کە مرۆ بەو یەقینەی هەیەتی بۆ مردن «چۆن دەتوانێ لە ژیان بەردەوام بێت» تارمایی مارت (ل٤) وەختێک لە هەڵدانەوەی لاپەڕە بێ ماناکانی ژیان وەڕس دەبێ، چیدی ناتوانێ چاوەڕێی ئەو یەقینە بێ و بۆ خۆی بە پیریەوە دەچێ و «دەرگا و پەنجەرەی گەراژەکە چاک گاڵە دەدات ئەو جا ئوتۆمبیلەکەی هەڵدەگیرسێنێ تا بە پەنگدانەوەی دووکەڵی گازەکە دەخنکێت» تارمایی مارت (ل٤)

* * *

## * کەسێتی

دەگەڵ کەمیی کەسێتییەکانی نێو ئەو شانۆیە کە تەنیا پێنجن «خاتوو ئەنکێلکا، گابریێل، ڤیکتۆر، ترێس، تارمایی مارت» بەهۆی گفتوگۆو پێداچوونەکانیانەوە یەکەکانی کەسێتی تارادەیەکی باش پڕ کراونەوە. تارمایی مارت وەک کەسێتی تەواوکەری هەریەک لەو چوار کەسێتییەکەی دیکەیە. بێجگە لەو تارماییە شتێکی دیکە، مانایەک بۆ ئەو کەسە زیندووانە دروست ناکات.

* لە حاڵەتی کەسێتییەکاندا ئەوەی جێی سەرنجە تەنیا ئەوەیە، کە جگە لە گابریێل ئەوانی دیکە کۆپی یەکترن، لە زۆر حاڵەتدا وا دێتە بەرچاو کە گابریێل دەگەڵ یەک کەس یان هەر تەنیا دەگەڵ داوڵ-دا دەدوێ.

## * دایەلۆگ

دایەلۆگەکان بەکەمترین وشەو لە سادەترین حاڵەتیاندا بیرە دژوارەکانی کەسێتییەکان و هەڵوێستی فەلسەفی نووسەر دەخەنەڕوو. دەتوانین بڵێین دایەلۆگ دەسەڵاتێکی گەورە، توانایەکی پڕ نهێنی دراوەتێ، بەنێو جۆگەلەکانی دایەلۆگدا لە ڕوانینە مەعریفییەکانی

نووسەر دەگەین. کە لە روانگەی «قسەوە» لە کەسێتی گابریێل بڕوانین «کە دەشێ نووسەر خۆی بێت» یا «تارمایی و بنەما ئەساسییەکانی بیری نووسەربن» ئەوەیە بە ئاسانی دەرگاکانی شانۆکە دەکرێنەوەو دەمانبەنەوە مێرگەکانی حاڵیبوون. هەر ئەو قسانەی گابریێل پڕن لەبەرائەت و حەقیقەت، پڕن لە بەرائەت و جوانی، پڕن لە بەرائەت و جورئەت، جورئەتی دەربڕینی شەرم و ترسنۆکی نەک جورئەتی پڕ ریاو پاڵەوانیەتی بێ بایەخ و ئازایەتیی شەرمهێن.

گابریێل جیا لە پیاوانی ئازا لەو هەموو شتانەی پیاو دەکرێ هەیبێ، دەڵێ: «من هیچ یەکێکیانم لەوانە نییە، من تەنێ ترسنۆکییەکەی خۆمم هەیە» تارمایی مارت (ل ٥٥)

* بەبێ بەکاربردنی ئێستاتیکای زمان، بەبێ گەیاندنی زمانی بەحاڵەتی پرسیار، دایە لۆگیش بێ بایەخ دەبێ، دەکرێ ئەو حاڵەتی بەپرسیاربوونە زۆر سادەش بێ.

گابریێل دەڵێ:

* ئێوە ئازاکان، ئێوە هەرگیزاو هەرگیز تێر نابن. (ل٥٦)

× ئازاکان! بەهەموو بوعدەکانییەوە.

× ئێوە، گرتن و خانەبگیرکردنی ئەو ئازایانەیە.

لەو رستە سادەیەدا «ئێوە ئازاکان» بێ ویستی خۆیان، دەکەونە بەرسیرە، ئەو سیرەیەی بەردەوام دایاندەبێژێ، بە تیرێک پڕە لە شەرمەزاری، «ئێوە هەرگیز تێر نابن»

* هەڵگرتنەوەی بیرو لێکدانەوەکانی نووسەر دەنێو وشەو رستەکانیدا کارێکی قورس و زێدە وردەکارە.

* * *

جووڵە؛ کە دەمارێکی پڕ حەماس و لەزەتی شانۆیە نەک هەر ئەوە ئەداتێکی بنەڕەتی دەربڕینە وەک زمان جیا لەوانەش رووباری فەنتازیاو ئیستاتیکایە ئەو توانایە وەگەڕ نەخراوەو دایەلۆگ ئەو خانەشی داپۆشیوە.

لەلایەکی دیکەوە ئەو شانۆیە گاڵتە کردنێکی توندە بەو بەهاو و بەنێو گەورەیی و پیرۆزییانەی هەرکەسەو یا هەر نەتەوەیەک ڕۆژێک لە ڕۆژان شانازییان پێوە کردووە. ئەویش دەنێو وشەی سادەو لابەلادا. گابریێل بە دایکی دەڵێ: «ئەگەر تۆ توانای بەخشینت هەبایە منت دەبەخشی.» (ل٦٣) مارتی پاڵەوان و ئازا بۆتە قوربانی گابریێل: ترسنۆک و بێ هێز ماوەتەوە. مارت و گابریێل دوو برا، دوو برای جیا لە فیکرو هەیکەل و قسەدا، دوو برا وەک مرۆ تەنیا بۆ ئەوە خوڵقاون لێکدی جیابن، پێکهاتەی شانۆکەش تەنیا لەسەر ئەو جیاکارییە وەستاوە: مارتی خۆشەویست و نموونە، گابریێل ... شەرم هێن و ترسنۆک.

## «بەخشینی ڕۆح»

کەس مافی بەخشینی لە ڕۆحێک زیاتری نییە، ئەویش ڕۆحی خۆیەتی، بەڵام دیسان ئەو ڕۆحانە دەبەخشین «ئەگەر توانامان هەبێ» کە لامان بێ بایەخن.

* ئەو دوو کوڕە لە ماڵێک، لە شارێک، لە وڵاتێک پێکەوە جێیان نابێتەوە، «کوڕی ئازا»، چونکە هەرگیز تێر.نابێت دەبێ نەمریش بۆ خۆی بەرێت، بەڵام شکانەوەی بەردەوامی گابریێل ئەو تەلیسمە دەشکێنێ و ئەوەی ناویان لێناوە قوربانیدان و بەخشین ریسوایان دەکا، چونکە ئەگەر توانایان هەبایە ئەویان دەبەخشی وەک سڕینەوەیەکی بەردەوام بۆ وجودی گابریێل. لە دوای جەدەلێکی زۆریش گابریێل دەگاتە ئەو حەقیقەتە بێ بایەخە: «پیاوە ناشرینەکان دەبێ ببنە پاڵەوان تا بەشێوەیەکی جوان بمرن و خۆشەویست بن» (٧٩).

## کۆتایی

یەکەم زەنگ و ئاگاداری بۆ چۆنیەتی کۆتاییهێنان بە شانۆکە، کۆتایی هێنانێکی سادە، لە بەشی سێیەمەوە دەست پێدەکات.

وەختێک گابریێل باسی دوا چیرۆکی وەرگێراوی خۆی بۆ ترێس دەکات.

«کابرا قوتابییەکی ئامادەییە دایکی خۆی کوشتووە» (ل٨٤) خوێنەر یا بینەر بێ ئەوەی مەبەستی بێت، یا بێ ئەوەی هیچ ئاگادارییەکی لەو قوتابییە هەبێ، چەکەرەی قەتڵێک یان کوشتنی «خاتوو ئەنکێلیکا دایکی گابریێل»ی لەلا دەردەکەوێ. ئەوەش بێ ئەوەی نووسەر مەبەستی بێت کۆتایی شانۆکە ئاشکرا دەکات گرنگ ئەوەیە کوڕێک دایکی خۆی دەکوژێ، ئەوەش کۆتایی شانۆکە دەخاتە بازنەیەکی مەحتومەوە. * تاکەیەک وشە نابینیتەوە لە مەبەستی گشتی شانۆدا نەبێ، ئەوەتا لە حاڵەتی پەشێوی و کوشتندا گابریێل دەڵێ: «دوای کوشتن و قەتل، پاش ساتێکی ئاوا ئازایەتی پیاو روخساری جوان خۆ دەنوێنێ.»

## تارمایی مارت

تارمایی مارت، بەپێچەوانەی شانۆنامەی بە نێوبانگی هاملێت لە دوا دیمەندا دەردەکەوێ، بەڵام دەرکەوتنی ئەو تارماییە لە حاڵەتێکی بێ هێز دایە و ئیزافەیەک ناخاتە سەر هەیکەلی گشتی شانۆکە، چونکە ئێمە ئەو تارماییەمان هەر لە دێڕەکانی سەرەتاوە لەبەرچاوە.

لە زۆر دەرگاوە دەکرێ لەو شانۆیە وەژوورکەوین، هەر لە دەرۆزەی ماچ و پاڕانەوەی خۆشەویستی، تا دانانی رایەڵێک لە نێوان «کوڕ و پیاو»دا، بەڵام رایەڵێکی فەلسەفی، رایەڵێک تەنراو بەجنس و ریا.

هیوادارم شانۆکاران گرنگی بەو شانۆیە بدەن و بیهێننە زمان.

# کچێک له نێوان دوو پیاودا

لۆرکا شاخێک له شانۆ، ولاتێک لەبەرگری و شۆڕش، دەریایەک له شیعر. گوڵێک له غەریبی.

هەموو شانۆنامەکانی لۆرکا هاوار و سەدای ئەو شۆڕشگێڕە هونەرمەندەیە کە چیدی سووکایەتی مرۆی پێ قبوڵ ناکرێ، بە ناسکترین و سیحرترین زمان، کە زمانی شیعرە تێکیان دەشکێنێ.

سەرەڕای هەستی مرۆڤ دۆستی و بیبری فەلسەفی و ڕێرەوی ئایدۆلۆجی، کە لۆرکا لەبەرهەمەکانیدا کاریان بۆ دەکات، توانیویەتی دەسەڵاتە هیشک و ئاڵقە باو و کۆنەکانی دەوری شانۆ تێک بشکێنێ و بەدەسەڵاتێکی بێ سنوورەوە مامەڵە دەگەڵ شانۆو کەرەسەکانیدا بکات.

بەرادەیەک هەموو تواناکان (تەکنیک و کات و شوێن و تەختەی شانۆیی) خستۆتە ژێر رکێفی خۆی و واتایەکی نوێی پێ بەخشیون. جوانترین فەنتازیا و بەکاربردنی لە ژیانی واقیعی هەڵێنجاوە. زیندوویی و ژیانێکی دیکەی بە سەرتاش و پینەدۆز و ئاسنگەرو مەی فرۆش بەخشیوە. واتایەک و وێنەو سیحرێکی نوێی بۆ هەر کامیان نەخشاندووە کە زۆر لەوێنەی واقیعی خۆیان بەرچاوترو کاریگەرترن.

## مرۆڤی بۆش

تراژیکۆمیدیەکە لە شەش پەردەدا. (ل١٤١- ١٩٧، ساڵی ١٩٢٢- ١٩٢٥) نووسراوە.

لێرەدا دەمانەوێ زیاتر لە زمانی شانۆنامەکە بدوێین، ئەو زمانەی کە روحی پڕ سیحری «عەزیز گەردی» براو وەرگێڕی بە سەلیقە و توانای بێدارڕژاوە.

مامۆستا (عەزیز گەردی) بە زەخیرەیەکی تەواو و توانایەکی رەهاوە سینتاکس و فۆرمی رستەکان دادەڕێژێ هەر وەک ئەوەی بۆ خۆی شانۆنامەکە بنووسێ.

روحییەتی شیعری زمانی لۆرکای نەک هەر پاراستووە بەڵکو سیحری وشە و مانای دیکەشی داوەتێ.

* هەر چەندە زمان لە هەندێ شوێندا، ئەداتی دەربڕین و گواستنەوەی حەقیقەت و رووداوە، بەڵام ئەوە پێویستییەکی هونەرین و لەو راستییەی سەرەوەکەم ناکەنەوە.

* بۆیە بە دڵنیاییەوە دەڵێین ئەگەر کات و داهێنانی نوێ و گۆڕانکاری لە تەکنیک و تەختە و دنیای شانۆدا رۆژێک لە رۆژان ئەو شانۆنامەیە تێپەڕێنێ و وەک شتێکی بەسەرچوو بێتە بەرچاو، ئەوە ئەو زمانە شیعرە وەک چرایەک هەر دەمێنێ.

* تا لە چاومان دێتەوە شەرابمان بدێ، فرمێسکی مەرجان، فرمێسکی یاقووت.... (مرۆڤی بۆش لاپەڕە ١٦٣)

* سەعات بە سەعات
لێت دوورتر، دوورتر دەکەمەوە
...... ... ...
چونکە چرکە بە چرکە ئارەزووی قووڵ
زیاتر ئاگرم تێبەردەدا. ل ١٧١

* یەکەم دەرگای بونیادی شانۆنامەی «مرۆڤی بۆش» لە لایەن رۆژیتاوە دەکرێتەوە کە دەڵێ «وای چەندم حەز لە مێردە ل ١٤٥».

پێکهاتەی ئەو رستەیە چەند پرسیار لای خوێنەر دروست دەکات، ئامادەییەکی پەنهان پێک دێنێ بۆ گەڕان بە دوای هەموو پەیوەستە شاراوەکانی ئەو دیوی «حەزەکە»، هەر زوو لە بونیادێکی پتەوی سادەو چەند دیوی زماندا گرفتە پەنهانەکانی ئەو حەزە دەخاتە روو لەنێو ئەو گرفتانەدا چەمکێکی باوی شانۆ «گرێ» دێتە گۆڕێ.
- (بەڵام وای خۆشم دەوێ)
- (پیرە پارەی پیس بابۆ خەڵک بێ - ل١٤٧)ئەوە ویستی دەروونی ئازاد و سنگی پڕ عیشقە. ئەو شتێکی ناوێ جگە لە جوانی و خۆشەویستی، ئەو کوڕەی دەوێ کە دەڵێ. «کە لای تۆبم قاچم دەبێ بەمس- ل ١٤٨) ئەو عیشقە جگە لە گۆرانی چەکێکی دیکەی نییە.
* لۆرکا جگە لە زمانی باڵای فەلسەفە جیهان بینیەکەی ئەوی زیندوو بەرز راگرتووە.
رۆزیتا «لە بەینی قەشە و باوکدا ئێمەی کچ تەواو شپرزەو بێزەوە بووین- ل١٢٥) لەو رستەیەدا سێ رەگەزی مرۆیی هەن، قەشە، باوک، کچ.
١- قەشە وەک دەسەڵاتی یاساو ئایین، قەشە وەک دەسەڵاتی کۆمەڵگە، قەشە وەک دەسەڵاتێک بۆ پڕ کردنەوەی ناخی بێ هێز و فشەڵی هەر کەسێک. قەشە وەک دەوڵەت.
٢- باوک دیوی دووەم و راستەوخۆ، یان ئەداتی راستەوخۆی هەموو ئەو دەسەڵاتانەی سەرەوە. باوک وەک کەڵەگاو تۆبز بەدەست و خاوەن قسە.
(١-٢- ٣- کچ) وەک یەکەم قوربانی (باوک و قەشە) ناسکترین گیا، بێ دەسەڵاترین خونچە.
کچ وەک کاڵا، کچ وەک لەزەت و بەس.
* رووتکردنەوەی کچ لە هەموو بەها ئینسانی و فەلسەفییەکانی، زەوت کردنی هەموو ماف و هەست و بیری و ئیهانە و سووک کردنی، ئەوەش تایبەت نییە تەنیا بە ئیسپانیاو شاری ئەندەلوس و هەولێر

بەڵکو ئەوە ڕێ و ڕەسمی هەموو ئەو کۆمەڵگەیانەیە کە (ئایین و باوک) تێیدا کەڵەگان.

ئەو ئایین و باوکەی لە بوونی هەر کەسێکدا ئامادەییان هەیە، ئامادەییەکی ڕەش، پڕ مردن، قورس و پڕ حەیاچوون، حەیاچوونێک کە مرۆ تەواو لە تواناو هێزی مرۆیی خۆی دادەڕنێ و دەیکاتە سیپاڵ. سیپاڵێک لە پاڕانەوەو نزا.

هەموو دەمێ تۆوی ئەو ترسە بڵاو دەکەنەود کە دەرچوون لەو یاسایانە...

«ئێوە دەچنە دۆزەخ و لە گەرمان دەمرن»

«ئێوە لە سەگان خراپترن - ل۱٥۳ مرۆڤی بۆش».

بەڵام لۆرکای شۆڕشگێڕو فەیلەسوف لە راوێژێکی تەواو واقیعی و سادەدا ئەو ژیان و یاسایە ڕەت دەکاتەوە، لەسەر زاری ڕۆزیتا دەڵێ

- «بەڵا من دەڵێم، سەگ کێی بوێ لەگەڵی ڕێک دەکەوێ»

وای چەندم حەز دەکرد سەگ بوومایە. مرۆڤی بۆش». لێرەدا ڕەت کردنەوەی بە «مرۆڤ» بوون، تەنیا مانای ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی تۆبزی «ئایین و باوک»ە، ئەو دەسەڵاتەی کە پێی وایە «خۆشەویستی و هۆگری سەرچاوەی هەموو شورەییەکە - ل۱٥۳ مرۆڤی بۆش»

* کریستۆبیتا نوێنەری تۆبزو دەسەڵات، نوێنەری قەشەو ئەو عەقڵیەتەی دنیا بەڕێوە دەبا.

تۆبزەکەی دەستی «بۆنی مێشکی لێ دێ -ل ١٦٧»

ئەو مێشکانەی پژاندوونی، ئێستاش ئەو تۆبزە تینووە، بابی ڕۆزیتا نایەوێ تێنویەتی ئەو تۆبزە بشکێنێ و ببێتە قوربانی بۆیە کچەکەی بە سەد لیرە دەدات.

* لۆرکا ئەو هەموو کێشە قورس و واقیعیانەی بە کارێکی شۆڕشگێڕی و خوێن چارەنەکردووە، ئەو کێشانەی ورژاندووە، ئەو پرسیارانەی بەزەینی هەموانەوە هەڵواسیوە، بە زمانێکی ناسک پڕ لە ڕوحی شیعر، بە تەکنیکێکی سادە و فەنتازیا، بەسوود وەرگرتن و

بەخشینی واتایەکی نوێ بە «سەرتاش و موس» سەرەتایەک بۆ کۆتایی دراماکە دادەنێ.
- «ئەم گوێزانە دەبینن؟ ئەمە سیحری سەر هەموو نهێنییەک دەشکێنێ- ل١٧٥» دۆزینەوەو بەخشینی مانای نوێ بەشتەکان نهێنی داهێنانە، ئەو شتەیە کە جوولەیەکی ئەفسانەیی دەخولقێنێ. بۆیە لێرە سەرتاشێن قسەیەکی هەیە بیکا.
- «ئێمەی سەرتاش لە سەگ باشتر بۆن دەکەین، لووتمان هەیە بۆ وشەی تارو هێمای ئالۆز، خۆمان پێشەوای ئاوەزین و... دەزانین داخۆ ئەو سەرە چ بیرو لێکدانەوەیەکی تێدایە- ل١٧٦ مرۆڤی بۆش».
* ئەفسانەو سیحرێکی پڕ واقیع خوێنەرو سەرتاش و خەڵکەکە سەرسام دەکات و بونیادێکی کۆمیدیش بۆ کۆتایی شانۆکە دادەنێ. ئەو سیحرەی کە سەرتاشەکە کەشفی دەکا.
- «زۆر سەیرە دۆن کریستۆبیتا سەری دارە- ل ١٧٨».
ئەو پیاوە بە دەسەڵات و تۆبز بەدەست و دوور لە هەستی مرۆ، دیارە دەبێ بێ دەمارو بێ خوێن بێ. وەختێک دەمرێ خوێنی لێنایەو ورگی پڕ لە ئاردە دارە.
لەو جوانی و داهێنانە، لەو فکرو وەرگێڕانە، هەر هێندەم لە دەست دێ بەهەر یەک لە روحی لۆرکاو گەردی ناسک بڵێم:
«حەز دەکەم ببم بەگوڵێک پەلکەکانم بوەرێنمە ناو دەستت.»

**سەرنج: لێرەدا تەنیا لە «مرۆڤی بۆش» دواوین.**

# ماکبێث

ژیان له تارمایی گەڕۆک زیاتر نییه
ژیان چیرۆکێکه گێلێک دەیگێڕێتەوە/ ل ٩٦ ماکبێث
گومان لەوەدا نییه که (ولیام شکسپیر ١٥٦٤ - ١٦١٦ز) مەزنترین شاعیری ئینگلیزو ناسراوترین شانۆنامەنووسی دنیایه، بۆیه خۆ له باس کردنی ئەو دەبوێرین و دێینه سەر شانۆنامەی (ماکبێث : Macbeth) که له دەوروبەری ساڵی (١٦٠٦ز) واتا دەساڵ بەر له مردنی نووسراوەو برای نووسەر ئازاد حەمە شەریف کردویەتییه کوردی.
ناچارین به پێی توانا ئاستەکان یان بوارەکانی کارکردنی ئەو بیریاره مەزن و تاقانەیەی (unique) دنیا دیار بکەین.
سەرەتا پێش چوونه نێو دنیای پڕ داهێنانی وەک شانۆنووس، دەبێ ئەوه بزانین که کۆڵەکه هەرەپتەوەکانی ساختومانی نووسەر (زمانەکەیەتی) ئاستەکانی کارکردنی شکسپیر لەسەر زمان ئەوەنده پڕ دەلالەت و وردەکاری و فراوانه که نهێنیی ئەفسوونەکانی سەخته بگیرێن یان بەتاڵ بکرێنەوە.
پانتایی زمانی وەک هەیکەلێکی گشتی و جەستەیەکی سەربەخۆ هەڵناوەو هەموو دووریبەکانی دیکه له حیکمەت و رووداو و ئەفسانەکانی لەوەوە شیتەڵ دەبن. زمانی شانۆیی یان شانۆگەرییه شعرییەکانی شکسپیر، ئێمه به هیچ شێوەیەک مەبەستمان ئەو شێوه

ئینگلیزییه دەگمەنە نییە کە وەکاری خستووە، مەبەستمان لە ئالیەت و بوعدەکانی کارکردن و لێبەستن و سەرخستنی زمانە بۆ لووتکەی بوونی یان مامەڵەکردن دەگەڵ زماندا وەک بوونەورێکی زیندوو و سەربەخۆ.

لەو خاڵەوە دەچینە ناو ئالیەتی کارکردنی نووسەر، هەوڵی دیارکردنی ئەو رایەڵانە دەدەین کە نەک هەر لەو شانۆگەرییە کاری لەسەر کردوون بەڵکو لە زۆربەی کارەکانیدا پشتی پێبەستوون.

**١- تارمایی:** تارمایی ئەو کەسایەتییە زیندوو و بەردەوامەیە کە شکسپیر تا دوا پلەی بەکارهێنان کەڵکی لێوەرگرتووە، نەک هەر لێرە لە سەرجەم کارەکانیدا تارمایی بانکۆ دێتە ژوورو لە شوێنی ماکبێث دادەنیشێت. ل٥٧

ئەو تارماییە نەک ماکبێثی پاڵەوان و دڵ رەق شەیتانیش لێی دەترسێ. ل٥٨

گرمەیە تاپۆی سێیەم، منداڵێکی تاج لەسەرە و درەختێکی لەدەستە ل٦٩

ئەو تارماییانە کەسایەتیی بێ ئەسەر نین و لەبوونی یەکەیەکەی کەسایەتییەکان شوێنکاریان هەیەو پێوەندیی پتەویان بە کامڵ بوونی رووداو و تەواوبوونی تەکنیکەوە هەیە.

**٢- راڕایی:** ئەو گومان و ترس و راڕاییەی لەناخ و هەست و نەستی خیانەتکار یان کەسایەتییەکانی پەیوەست بە خیانەت یان (گرێچنی سەرەکیی درامایەکە) دروست دەبێ، خاڵی دەستپێکردنی گومانی شکسپیرە لەژیان و شانۆ، هی کەسایەتییەکانە لەبەردەوام بوون و مانەوە. ئەو راڕاییە داینەمۆی سەرتاپاگیری شانۆگەرییەکانیەتی و هەر لەوێشەوە هەستەکانی بینەر یان خوێنەر داگیر دەکات و دەیخاتە ژێر رەحمەتی رووداوەکانی دواتر.

ئەو راڕایی و گومانە و نەگەیشتن بەهیچ ئەنجامێک و لەقاندنی پرسیارە گەورەکانی توخمی مرۆ لەو هۆیە سەرەکییانەن کە خولیای مرۆی داگیر کردووەو شانۆکانیشی زیندوو راگرتووە.

- خیانەت خراپترین کاری خۆی کرد! نەشمشێر و نە ژەهر
نەکینەی ناوخۆیی، نەلەشکری دەرەوەو
نەهیچی دی لەوانە پێی دەکەن. (ماکبێث)
ڕوخسار گۆڕان مانای ترسانە/ ل۲۲

هەر ئەو خیانەت و ترسە لە خیانەت و دژایەتی خیانەت کەسایەتییەکان پێدەگەیەنێ و دراماش دەگەیەنێتە پایان.

**۳- کوشتن و خوێن:** قەناعەتی گەورەی شکسپیر لەهەموو شانۆکانیدا ئەوەیە کە کوشتن، «کوشتن و خوێن» شتێک نین بشاردرێنەوە، وەک مۆرک لەسەر جەستەو هەڵسوکەوتی کەسایەتییەکان و تەختەی شانۆ و کۆمەڵ دەمێننەوە، ئەو خوێنە، ئەو بۆنی خوێنە کار لە پرۆسەی ژیانی کۆمەڵ و لە وردەکارییە هەرە بچووکەکانی کۆمەڵگا دەکا.

بە واتایەکی دیکە، خوێن سەرتاپاگیرە، خوێن ڕشتن کە بەرهەمی تاوانە ناسڕدرێتەوە، ئەو خوێنە ڕەمزە بۆ نیاز پیسی مرۆ و ڕەمزە بۆ نەهامەتییەکانی دنیا.

ئەو خوێنەش هەرگیز توانای ون بوون و چوونەوەی نییە، چونکە دەبێتە مۆرک و هەڵسوکەوتی کەسەکان و بەگیان و ماناو دەستیانەوە دەنووسێ.

- کوشتنە بە دزییەکانی بەدەستەکانییەوە نووساون. ل۹۰
- ئاخۆ هەموو ئاوی شادەریاکان ئەو خوێنەی
دەستم دەشۆن؟ نەخێر ئەو دەستانەم
تەنانەت هەموو ئاوی دەریاکان
لەسەوزییەوە سوور هەڵدەگەڕێنن. ل۳۵

**٤- خۆشەویستی زێدو خاک:** ئەو خۆشەویستییەی لەو شانۆگەرییانەدا هەیە دەلالەتن بۆ خۆشەویستی «نیشتمان» لە ئەزەلەوە. چوار سەد ساڵ لەوەوبەر شکسپیر بەو جۆرە ناوازو پڕ هەستە باسی نیشتمان دەکا.

ڕۆز: مخابن، بۆ ولاَتە هەژارەکەم
ئەوەندە ترساوە وەختە خۆی نەناسێتەوە،
ناتوانین بلێین دایکمانە، بەڵکو گۆڕمانە
هەواکەی بەئاخ و ناڵەو قیژە شەق کراوە. ل٨٣
ماکدەف: ئەی ولاتی هەژار، دەبا هەر خوێنت لێ بتکێت. ل٧٨

**٥- خراپە:** قەناعەتی نووسەر بەوەی کە خراپە لە مرۆڤدا موتوربە کراوە، یان خراپە دەبەشرێتەوە وەک چۆن جادووگەرەکان دەیدەن بەماکبێث.

- من هەموو جۆرە خراپەیەکی تایبەتیم لێ موتوربە کراوە
بێت و ئاشکرا بکرێن. «ماکبێث»ی رەش وەک بەفری سپی بێگەرد دەردەکەوێت. ل٧٨

When they shall be opened black Macbeth
Will seen as pure as now. P. 175

شکسپیر «وەک دیارە» snow- بەفری بەکار هێناوە وشەی «سپی» بەرانبەر رەش قوت نەکردۆتەوە بەو باوەڕەی بەفر ئەو مانایە سادەیەی تێدایە.

**٦- باری دەروونی:** دەشێ شکسپیر یەکەم بیریار بێ لەدیارکردنی حاڵەتە دەروونی و شۆڕبوونەوە بەنێو سایکۆلۆژیەتی مرۆدا دوای شانۆنامەنووسەکانی یۆنان لەچەرخە زێرینەکانی ئەو ولاتەدا لەسەدەکانی شەش و پێنجی پێش زایین و دواتریش وەک سۆفۆکلیس و ئەسخیلۆس...تاد. بەتایبەتی کاری تاوان لەسەر هەست و دەروونی کەسەکان، بەتایبەت بکەرانی کارکردنی لەسەر خانەو توخمە پەنهانەکانی مێشکی مرۆ گەیاندوویانەتە ئەو راستییەی کە مرۆ لەمەستی و باری خەو و حاڵەتە نا ئاگاییەکانیدا راستیەکان دەدرکێنێ.

- دەستت بشۆ، جلی خەو لەبەرکە، وا رەنگ زەرد مەبە
پێت دەڵێمەوە، بانکۆ نێژراوە. ل٨٩

**٧- پێشبینی:** دەبوو ئەوە یەکەم خاڵ بێ لێی بدوێین، چونکە ئەو خاڵە لەکارو گرنگیی شانۆدا یان لە پلۆتو و هەیکەلی درامیدا بەگرنگترین خاڵ یان رەگەز دادەنرێ، چ نەبێ لەو هەموو پشت بەستنەی شکسپیر بەو حاڵەتە.

پێشبینیەکە لەبنەما هەرە سەرکییەکانی هەیکەلی گشتی کارەکانی، لەبواری کاری دەروونناسیشدا ئەو وتەو هێمایانەی وەک دەستاوێژێک یان کلیلێک بەکار دێن خاڵی سەرەکین بۆ چوونە نێو کەسایەتییەکان و کەشف کردنی توخم و ناخی هەر یەکەیان بەشێوەیەکی بنبڕو هەر لەسەرەتاشەوە.

- هەواڵێکی گرنگی هێناوە
قغەی ئەو قەلەڕەشەی کە هاتنی مردنی «دەنکەن»
بۆ ژێر باجەمان دەقرێنێت. ل٢١

ئەوە پێشبینی کوشتنی شا «دەنکەن»ە پێش رووداننی..

جگە لەو پێشبینیانەی بەحوکمی وریایی خۆی دایڕشتوون، لەوانیش گرنگتر ئەو پێشبینانەن کە لەسەر زاری کەسە غەیبی و تارمایی و جادووگەرو فەلەکزانەکان یان پیاوانی پیرۆزو هێزی ئاسمان دەگێڕدرێتەوە.

لە شانۆنامەی ماکبێثدا هەر لەسەرەتاوە ئەو سێ خوشکە جادووگەرە دەردەکەون کە رایەڵە هەرە سەرەکییەکانی درامی و رووداو دەکێشن و بەهێما دەیدەنە دەست.

هەر چیرۆکە لەسەر بنەمای ئەو نهێنییە هەڵچنراوە ئەوان دەیخولقێنن.

لەدیمەنی یەکەم «رۆحیەتی جادوو- نهێنگر» دەسەڵات بەسەر شانۆدا دەگرێ لەدیمەنی سێیەمدا تانوپۆی درامی بەتەواوی دەکێشرێ و پێشبینییە سەرەتاییەکان دەخرێنە روو و پایەکانی تراژیدیا هەڵدەنرێن.

- سێیەم جادووگەر: سڵاو، سڵاو لەتۆ ماکبێث، ئەی ئەوەی پاشتر دەبیتە شا.ل١٢

ئێمە لەو پێشبینییەوە دەتوانین بەنهێنی پێوەندییەکانی دیکە ئاشنابین و وتەو مەبەست و سەرەکییەکان بگرین، هەر ئەو نهێنییە کەسایەتیی ماکبێث کامڵ دەکات و تراژیدیا دەگەیەنێتە لووتکە.

ئەوەش خولیایەک لەناخی ماکبێث-دا دروست دەکات و بەدوای پایە سەرەکییەکانی حوکم و ژیانی دەکەوێت، بەڵام جارێکی دیکەش هەر لەسەر دەستی ئەو جادووگەرانە دەکەوێتەوە نێو مەینەتییەکانی گومان و ترس. وەختێک پێی دەڵێن:

– خوێن ڕێژ بە، ئازاو چاونەترس.

گاڵتە بەهێزی مرۆڤ بکە. لەوەی لە ژنان بووە مەترسە. ل٦٩

– ماکبێث هەرگیزاو هەرگیز نابەزێت

تا دارستانی «بێرنام»ی مەزن لە دژیا

بەرەو گردە بەرزەکانی «دەنزینەن» نەیەت.ل٧٠

هەر ئەو دوو نهێنییە ڕووداو بەکێش دەکەن و ماکبێث دەخەنە بازنەی بێ دەسەڵاتی و تەکنیکی شانۆش تەواو دەکەن.

* * *

دەشێ پێوەندیی ماکبێث و ژنەکەی دووبارە بوونەوەی هەمان چیرۆکی پڕ تراژیدیای ئادەم و حەوا بێت. خاتوو ماکبێث بەسەر سەختی و ڕژدی هەموو خەنجەر بەدەستانی دنیا هانی ماکبێث دەدات بۆ بەدیهێنانی قسەکانی «جادووگەرەکان یان شەیتانەکان» جگە لە ڕێگای کوشتن ڕێگەیەکی دیکەی لە پێش ناهێڵێتەوە بۆ ژیان. جگە لە ڕێگای کوشتن ڕێگایەکی دیکە نابینێ بۆ خۆشگوزەرانی و شکۆمەندی. دوای ئەوەی ماکبێث ئامادە دەکات بۆ کوشتنی شا دەڵێت:

– ئەگەر بەس لەخەودا بەباوکم نەچووبا بەخۆم دەمکوشت. ل٣٢

ئەوەش سەرەتای بەدیارکەوتنی «کوشتنی باوکە» لەئەدەبدا نەتەنیا بەبیرهێنانەوەی وشەی باوک بەڵکو بە کوشتنی «پاشا».

دەربارەی وەگێڕان یان کردنە کوردییەکەی:

دەشێ ئەو کردنە کوردییەی کاک ئازاد باشترین وەرگێڕان بێ کە

ئێستا لەتوانای رۆشنبیری کورد دابێت بۆ شاکارێکی وا بەنرخ و گەورەی دنیا، دەنا بەرای ئێمە ئەو بابەتە ناوازەو دانسقەیە دەبێ زۆر بە وردکاری و دەستەجەمعی و راوێژکارانەو بە ئەمانەتی گەلێکەوە بۆ کولتووری دنیا وەرگێردرێت.

ئێمە لەو کارەماندا بەهیچ شێوەیەک کاری بەراوردکاریمان نەکردووە، بەلاّم لەکاتی خوێندنەوەدا سەرنجی ئەوەمان داوە کە بەرانبەر «Water- rugs» دەشێ سەگلاّک بێ نەک سەگی دەو ئاوێ و لەجێگای قوتە سەگ «توولە»مان هەیە کە ئەو سەگەیە بەرەسەن بچووکە، یان بۆ ئەسپ خۆشرەو یان خۆشبەز لەجێگای خۆش برۆن/ ل٤٦، لە راڤەکردنی وشەی کارەکەر نووسراوە «نۆکەری ئافرەت» دەشێ هەڵەی چاپ بێ دەنا (نۆکەر) بۆ ئافرەت بەکار نایە.

کاک ئازاد بەشی زۆری وەرگێرانەکەی بەپشت بەستن بەو راڤە «وردانەی» کە بۆ دەقەکە کراون لەو «چاپەی» لێی وەرگرتووە، ئەگەر بکرێ دەپرسین «ئەرێ ئەو راڤە کردنانە دوا تێگەیشتن و راسترین لێکدانەوەن بۆ حیکمەت و زمانی بەربلاوی شکسپیر؟»

ئەو پرسیارە ئاراستەی کەس نەکراوە، ئەو پرسیارە بەشێکە لە (خۆ تێ هەڵقورتاندن)ی من بەرانبەر بە وشە. ئەو پرسیارە لەکاک ئازاد دوورە، بەلاّم دەشێ ئەو زیاتر لە هەمووان لەو پرسیارە بگات، ئەو پرسیارە لە مێژوو کراوە.

# ژیان بێ گفتوگۆ مەحاڵە

ژیان بدە دەم با، ژیان بهاوێ نێو ئاوێ، لەسەر ئاگری دانێ، دیسانەوە بەردەوامەو ئەستەم نییە، ژیان بەبێ زەمەن، ژیان بەبێ مێژوو، ژیان بەبێ شارو شارستانییەت دیسانەوە بەردەوامەو ئەستەم نییە.

* ئەرێ ژیان بەبێ گفتوگۆ مەحاڵە؟

* برای بەڕێز (سەرۆ قادر) بە نۆ وتاری رۆشنبیری، کە هی نۆ کەڵە نووسەری دنیان، وێڕای کورتە وتارەکەی خۆی، دەیەوێت واتایەک بۆ «گفتوگۆ» هەڵچنێ، هەر نۆ وتاریش لەگەڵ رۆشنبیران و هەر لەوانیش دەدوێن. ئەوە سەرەڕای ئەوەی هەریەکە لەو پێشەنگانە پشتیان بە بیروڕای چەندان نێوداری دیکە بەستووە.

* شاهروخی تویسرکانی لە زمانی تۆلستۆی-ە وە دەڵێت: «رۆشنبیران وەک ئەو مرۆیە کەرانەن کە وەڵامی پرسیاری ئەوتۆ دەدەنەوە لێیان نەپرسراوە.ل٧».

* بەپێی رای کانت بێت «نابێ چاوەڕوانی لەرۆشنبیر بکرێ، بچێ رێگایەکی خۆشنەکراو بکوتێتەوە. ل٧»

ئەوە سەرەڕای پێناسی توند و یەک مەودای هەریەک لە «ئۆکتاڤیۆپاز» و «هەرتسن» دەربارەی رۆشنبیری «راستەقینە».

وشەی راستەقینە لای هەردوو نووسەر و شاهروخی، رۆشنبیری

خانەبگیر کردووە و خستوویەتیە قەفەزەوە، جا توانیویانە وەسفێکی شایانی بکەن «رۆشنبیری راستەقینە کەللەسەری هەر میللەتێکە.ل٨»

* خانەکانی دابەشکردنی کۆمەڵ بەپێی رادەی رۆشنبیری و زانستییەوە بێ ئەنجامن و زۆرجاریش بێ بایەخن. یەکێک لەو بیرورایانەی کە ئێستا پێچەوانەکەی راستە «تێکەڵکردنی رۆشنبیرو تێکۆشەرە».

* شاهروخی تویسرکانی دەڵێت «ئەوەی کە تەماشای کورسی دەسەڵاتداران دەکات.. هۆشیارانە دەکەوێتە دەرۆزەکردنی ئازادی، ئەو کەسە قەت رۆشنبیرنییە.ل٨»

* * *

کەیخوسرەو جەمشیدی بەهەمان شێوە رۆشنبیران بۆ دوو خانە دابەش دەکات «جەنگاوەرێکی زانا، یان پیاوێکی قوتبنەما، واتە خیانەتکار.ل١٦».

رای ئەو پیاوە زاناو بەحیکمەتانە زۆر لەوە سادەترن لەو (گفتوگۆ)یانەدا جێیان ببێتەوە کە بێ ئەوان ژیان (ئەستەمە) چونکە ئێمە پێش وەخت لەسەر ئەوە کۆکین کە «سوقرات و کریتون» هەردووکیان رۆشنبیرن، ناکرێ هیتلەری شێوەکارو مۆزیکازان و شاعیر رۆشنبیر نەبووبێ، بۆیە «رۆشنبیر ناچێتە نێو ئەو پێناسانەوە».

رایەکانی برنادشۆی فەیلەسوف، راستە دانسقەو پڕ حیکمەتن، بەڵام زیاتر لەسەر رەفەکانی کتێبخانە جێیان دەبێتەوە تا نێو دنیای زیندوو.

«دۆستەکانت زلترین بزنن، .. جوان نین، خۆیان رازاندۆتەوە، زانا نین بڕوانامەی زانکۆیان هەیە، دەوڵەمەندنین پارەدارن، دڵ فراوان نین بەندەی ملکەچن، دلێر نین کەچی شەڕ هەڵدایسێنن، لێهاتوونین پایەپەرستن، ...»

سەرەڕای ئەوەی کە برای وەرگێڕ زۆر بە بوێری دەڵێ: «ئێمە لەبزنەکەی بەرنادشۆ دەکەین، بەڵام دەشێ بپرسین ئەوە تەنها حاڵی رۆشنبیرانە؟

زۆرمان نەوتووە کە بلێین ئەو دنیایە بەخراپ و چاکیەوە لەسەر ئەو «بزنانە» بەندە.

ئەو بزنانە زیرەک و ئازان، ئەو بزنانە دەست بڵاو و وردەکارن، ئەو بزنانە خاوەن دەسەڵات و یاسان، زمان زان و لێهاتوون، ئەو بزنانە دەفرن ئەو بزنانە شایەنی ئەوەن سوقرات لەبەر دەرگاکانیان ئاوی چۆکی دابێ.

* * *

* د.مەهدی پەرهام لە «کەسایەتی و پەیامی رۆشنبیران» دا راکانی خۆی بە جوانترین گوڵی دیموکراسی رازاندۆتەوە «ئامادەم گیانم فیدا بکەم تا تۆی دژی من بتوانی قسەی خۆت بکەی. ڤۆلتێر. ل٢٤»

* تائێستا ئەو گەوهەرەی ڤۆلتێر، کە زۆری دیکە بەشێوەی جیا جیا دووبارەیان کردۆتەوە، نەک لەنێو پەرلەمان و راوێژکارو زانا و دەسەڵاتداران نەبینراوە، ئەو رایە لە ماڵی بێ «چەکی» کۆمەڵدا جێگایەکی نییە.

* د.مەهدی پەرهام حەوت خاڵ دیاری دەکات کە رۆشنبیریان پێ دەناسرێنەوە. یەکەمیان دیفاع لە ئازادی رکەبەر، دووەمیان نارەزایی رۆشنبیر، سێیەمیان «نەکوشتنە». چوارەمیان باوەربوون بە گفتوگۆ، پێنجەمیان «تێنەگەیشتنە لە پێکەوە ژیانی بەئارامی» شەشەمیان «نسبی گەرایی» حەوتەمیان «تێگەیشتنی دیموکراسییە».

«چونکە ئەگەر رۆڵی گەل نەما، لەبەرزەفتکردنی دەسەڵاتداران وڵات بەرەو بۆگەنی فەساد دەچێ».

* * *

* رۆڵی نووسەر لەجیهانی سێیەمدا، ئەوە نێونیشانی وتاری «تاهیر بن جەللون»ی گەورە نووسەری عەرەبانە، نووسەر بونیاتی وتارەکەی لەسەر وەڵامدانەوەی نووسەری ئەمەریکایی «فلیپ روت» رۆناوە. فلیپ روت پەردە لەسەر تەنیایی پەناگیریی نووسەری ئەمریکا لادەدات. (تاهیر بن جەلوون) هەر لەسەرەتاوە بۆ زمان و «مەنتیقێک»

دەگـەڕێ کـە تەواو پێـچـەوانەی فلیپ روت بێ، بۆ ئەوەش پشت بەرایەکانی رۆشنبیری گەورەی عەرەب «کاتب یاسین» دەبەستێ.
دەشێ چەند وردە تێبینییەک لەسەر ئەو وتارە بنووسین.
١- لەو وتارەدا تایبـەتمەندی کـۆمـەڵگە تا رادەیەکی زۆر پشـتگوێ خراوە، چونکە پێکەوە ژیان و رادەی پێگەیشـتنی تاکـەکـانی کۆمـەڵ وەزیفەی رۆشنبیر دەگۆڕێت.
٢- ئێـمـە نامـانەوێ بەچاوێکی رەخنەو هەڵسـەنگاندن ئەو وتارە بخـوێنینەوە بەڵام دەپرسین ئەو رایانە بەرەو کـوێمـان دەبەن؟ بۆ نموونە «کـتـێبێک بۆ ئەو منداڵانە بنووسین کە لەبرسان دەمرن، ناگـەنە هیچ، یان شیـعرێک، رۆمانێک ناتوانێ دیکتـاتۆرێـک وەدەرنێت و ئابووری وڵاتێک بگۆڕێت. (ل٣٤) ئەو رایە نـاکـامڵ و بێ بنەمـایانە لە بەهێند هەڵنەگرتنی ئەدەب و کلتورەوە دێن وەڵامێک ناگرنە خۆیان.
٣- حەماسی خەڵکی بۆ شیـعرەکانی «مەحـموود دەروێش» هەرگیـز لەتواناو بەرزی رادەی رۆشنبیـریی کـۆمـەڵگەی عـەرەبانەوە نەهاتووە ئەوەندەی لە توندڕەوی و دەمـارگـیـریی نەتەوە پەرسـتـانی عـەرەبەوە هاتووە، چونکە نەک گەنج و رۆشنبیـرانی بەرپێی مەحـموود دەروێش، دەروێش خۆی لەهەنگاوی یەکـەمی تاریفە بەنێوبانگەکەی ڤۆڵتـێر بۆ رۆشنبیـر سـەرنەکـەوتووە و نووچی داوە، دەروێش دوای سـەدەیەک لە خـوێندنەوەو تێگەیشتن کـە دەزانێ «کـورد دەیەوێ هەناسـەبدات و بەڕاستی برای خاوەن بەش بێت» ئەوە بە ئیهانە و شەق دان لەشەڕەفی عـەرەبی دەزانێ «جـوانتـرین گـوڵی شـیـعـری» کـە کـوردسـتـان-ە لە دیوانەکەی دەردێنێ.

* * *

* ژیان بەبێ گفتوگۆ ناکرێ.
دەشێ ئەوە درەوشـاوەترین وتار بێ لەو بوارەدا، کـامـۆ وەک نووسـەروخـاوەن فـیکری گـەورەی دنیـا، زۆر لە مـەسـەلە گـەرمـەکـانی رۆشنبیری یەک لاکردۆتەوە. کامۆ بەزمانی قەڵەم ئەو راستییە ئاشکرا

دەکات کە چەک سڕیبوویەوە. «مێژووی ڕەسمی هەمیشە بریتی بووە لەمێژووی بکوژان. ل٤٠» هەمیشەو بێ بڕانەوە بکوژو خیانەتکاران خەڵاتکراون و بوونە ڕابەری مێژوو.

* بەدەست ئێمە نییە ڕای ئەو کەڵە فەیلەسووفانە یەکاویەک نایەنە دی، کامۆ دەڵێ: «گاڵتەجاڕییە ئەگەر دەسەڵاتداران بیانەوێ ڕێنماییمان بکەن و ئیلتزامان بەسەردابسەپێنن.ل٤٢) بەشێوەیەکی گشتی هەتا ئەوڕۆ، دەنگی ڕۆشنبیران و خاوەن فیکران بە«کامۆشەوە» ڕوتوش یان ئەوەی نێوانیان لێناوە «تەواوکەری ویقار»ی خاوەن دەسەڵاتە.

* دیارترین خاڵ لە وتارەکەی کامۆدا کە تائێستا سەنگی خۆی هەیە، ئەوەیە کاتێک هیچ دەروازەیەک بۆ گفتوگۆ نامێنێ، یان لەنێوان «بکوژو کوژراو» زمانێک نییە بۆ تێگەیشتن، لەبەرانبەر خوێن و کوشتن، زۆرداری و قین زمان مانایەکی نامێنێ. لەو ساتانەدا دەبێ «یان بمری یان بجەنگی ل٤٥».

*　　*　　*

* هەردوو وتاری پرۆفیسۆر ڕیچارد ڕورتی ئەمەریکایی و موتەزا هاشیتاری ئێرانی، مەودایەکیان نەهێشتووەتەوە بۆ قسەی بەرانبەرو ڕێگای دایەلۆگیان بەسەرخۆیاندا داخستووە. هەرچەندە هەندێ بۆچوون و ڕای باویان بۆ خزمەتی خۆیان دووبارەکردۆتەوە بەڵام ئەو ڕایانە لەبەرانبەر «فرمانەکانیاندا» بێ سێبەرن.

* کۆتایی، کورد دەڵێ: «مار بەقسەی خۆش لە کون دێتەدەر» دوای ئیسلامیش ئەوە باوە «کوتەک لە بەهەشتەوە هاتووە» ئەمڕۆ نەمار کاری بەقسەی خۆشەو نەکەسیش کوتەکی بەهەشتی بەدەستەوەیە، لەنێوان ئەو دوانەدا مەنزڵێک نییە بۆ پێکەوە ژیان.

* گفتوگۆ بەبێ پشت بەستن بەهێزێکی گەورە و فیکری ئامادە پاڕانەوەیە.

* سەرەڕای قسەی جوانی ڕۆشنبیران ژیان ئەوەی سەلماندووە کە هیچ

گـۆڕانێکی بنەڕەتی لە ژیانی کـۆمـەڵ و نەتەوەو دنیـادا بە (گـفـتوگـۆی ڕووت) مەیسەر نابێت. خاوەن دەسەڵات هەرگیز کارێکی بە «گفتوگۆ» نییـە، ئەگـەر ڕۆژێکیـش داوای دایەلۆگی کـرد تەنیـا بۆ ئەوەیە شـوێنێ هاواری ڕکەبەر بدۆزێتەوە تا قوڕی دات.

* دیارترین و جوانتـرین شوێنی ئەو کـتێبـە کارە هونەریەکانییـەتی، تا بڵێی باڵاو بەرزن، هەموو ئەو گوتارو فەلسەفانەن کە ناوترێن.

* * *

* هیـوادارین دڵسۆزان زیاتر گرنگی بە وەرگێڕان بدەن و کـتێبخـانەی کوردی پێ دەوڵەمەند بکەن.

# بۆریس پاستێرناک لەسەدەی ئیدیۆلۆژیادا

* بۆریس پاستێرناک ئەو ناوەی شەڕی ئیدیۆلۆژ و داهێنانی ئەدەبی تێدا تێکەڵاو بوو. پاستێرناک ئەو ناوە پڕ نهێنی و خولیا سەیرانەی تائێستا شاراوەن. ئەوانەی پاستێر ناکیان بریندار کردو کوێرانە بەنێوی شۆڕش و بیرو باوەڕەوە دژی وەستان نەیانتوانی بەڵگەیەکی هەرە چووکەڵە لەدژی بدۆزنەوە. ئەوانەش کەبەتووندییەکی سەیرترەوە بەرگریان لێ کردو ناحەزەکانی ئەو نووسەرە نامرادەیان بە «مل شۆڕ و دڵ رەق وبێ ئابروو» ناوبرد هەرگیز ناتوانن بۆ جارێکیش هەڵوەستەیەک لە نۆبێلەکەی بکەن.

* ئەو کتێبە سەرەڕای پێشەکییەکی کورت بەقەڵەمی وەرگێڕو پاشبەندێک بو کرنۆلۆژی ژیانی شاعیر لەچوار وتار پێک دێت. سێ وتاریان بێڤگێنی کوڕە گەورەی پاستێرناک نووسیونی و ئەوی دیکەیان ئی «ئا. ئاسمسۆس»ە.

**١- ژیانی شاعیر «پاستێرناک» «ل ٥-٢١»**

«١٠ی شوباتی ١٨٩٠- ٣٠ی مایس ١٩٦٠»

پاستێرناک هەر لەسەرەتای ژیانییەوە وەک داهێنەرو ئەدیبێکی گەورە هاتۆتە نێو دنیای رۆشنبیری رووسییەوە. هەستێکی بەمۆزیکا

گۆشکراو روحێکی هونەرمەندانەی هەبوو. ئەگەر ئەدەب ئەو کەڵە رۆشنبیرەی راپێچی دنیای شیعرو رۆمان نەکردبا لەوەی بوو ببێتە فەیلەسوفێکی دیاری ئەم سەدەیە.

پرۆفیسۆر کۆهین پێشنیازی بۆ پاستێرناک کرد... تاخۆی بۆ پرۆگرامی دۆکتورای فەلسەفە ئامادە بکات. ل١١) ئەوەش لەساڵی (١٩١٢) کەتەمەنی شاعیر بیست و دووساڵ بوو. تاتەمەنی چل وشەش ساڵی خەریکی داهێنانی خۆی دەبێت.

بۆ یەکەم جار [لە پایزی «١٩٣٦»ە وە دەمو دووی رۆژنامەکان بەرانبەر پاستێرناک بەئاشکرا گۆڕا «گۆران» ل١٧]

تا رۆژی مردن لەشەڕ دابوو. سەدەی ئیدیولۆژیا بەهەموو دیوەکانیەوە ئەزموونێکی گەورەی ئەو سەدەیە بوو، گوڵی پاستێرناک لەو نێوەدا هەڵپڕوکا.

**٢- «تۆ دەژییت، تۆ لەناخمای هەر وەکوو خۆت... ل٢٢-٣٣»**

دووەم وتاری یێڤگێنییە، بۆ ژیانی هاوسەری پاستێرناک و یەکەم ژنی «یێڤگێنیا موراتۆڤ» تەرخان کراوە. ئەو هاوسەرییە نائارامەی دەساڵی خایاند. «لەکۆتای ١٩٢١ وەتا بەهاری ١٩٣١). هەرچەندە یێڤگێنی کوڕە گەورەیان لەساڵی (١٩٢٣)دا لەدایک دەبێ، ژیانی ئاسایی دەبەنەسەر، بەڵام وەک یێڤگێنی دوای دەنووسێ «نامە گۆڕینەوەی «باوکم» لەگەڵ مارینا تسڤێتا یێڤنادا.... گەرمی وتادی پەروازی عاشقانەی نامەگۆڕینەوەیان شتێک نەبوو دایکم بەرگەی بگرێ. ل٢٩» تالە ئەنجامدا پاستێرناک باسی «زینایدا نیکۆلا بێڤنا» دەکات کە «چ تەئسیرێکی گەورەی لێ کردووە. دایکم نەیتوانی ئەمە قەبووڵ بکات وخێزانەکەمان لەبەر یەک هەڵوەشایەوە. ل٣٢»

**٣- «رازی دڵگیرییەکەی تۆش وەرامی مەتەڵی ژیانە ل٣٤- ٣٩»**

ئەو وتارە ئا. ئاسمۆس نووسیویەتی دەربارەی ژیانی خۆشەویستی وپڕ سیحری هاوسەری پاستێرناک لەگەڵ ژنی دووەمی «زینایدا نۆیهاوس» زینایدا بەمۆزیکاو بەجوانی وشوخیەکەی ژیانی پاستێرناکی

پڕ کردبوو لەخۆشی.

پاستێرناک دەربارەی زینایدا دەڵێ:

* ئارەزووم ئەوەیە کە دەمرین،
شریتی ژینمان دەپسێ و ئێرە بەجێ دەهێڵین،
لەقافییەیەکدا دابنرێین سفتوسۆڵتر
لەوەی کەدڵ و گوێچکەی دل وێکڕا دەبەستێتەوە. ل٣٩

**٤- «خەلاتی نۆبێل»ەکەی بۆریس پاستێرناک. ل٤٠- ٥٠**

دەشێ ئەوە گەرمترین ودیار ترین ڕووداوی ژیانی پاستێرناک بێ. ئەو سەدەیەی شاعیری تێدا ژیا کەدەتوانین نێوی بنێین «سەدەی ئیدیۆلۆژیا»، ئەو ئیدیۆلۆژیایەی خەلاتی نوبێلی بەپاستێرناک بەخشی و ژیانیشی لێکردە دۆزەخ.

ئیدیۆلۆژیا- ئەو فیکرو بیرو باوەڕانەی دەنێو ئەو نێوەدا چڕ کراونەوە دەشێ ئەو چرایەبێ کەنەفسی بریندارو پڕ بوغزی مرۆ بیکاتە شمشێر، بیکاتە دۆزەخ. ناکرێ هەروا بەهەوای نەفەس وەک بۆتە- باو- دا کرژێینە سەرو گوێلاکی. ناکرێ چاویش لەوە بپۆشین کە ئیدیولۆژیا، بەوی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواو ئیسلامیشەوە چەندە ئازادیت دەداتێ سەد هێندە کۆتت لەمل دەکا. ئیدی ئەوە مرۆیە تا دەرمانێک وەگیر دەخا سەد خەنجەری وێ دەکەون.

دەبێ سۆز یان ڕق وامان لێنەکات ئەوە نەبینین کەلە «سەدەی ئیدیۆلۆژیا»دا نەک خەلاتی نۆبێل، خەونی نۆبیلیش سیاسەت دەوری سەرەکی تێدا دیوە.

دەشێ لەدوا دواییەکانی سەدەی ئیدیۆلۆژیا بلێین ئەگەر بلاو کردنەوەی دکتور ژیڤاکۆ لەئیتالیا خەلاتی نۆبێل و کێشەکە هەمووی دروست کراوبێ و بەمەبەست بووبێ، دەبوو نووسەرانی بەرزی خاوەن فیکر ئەو مافەیان بەخۆدابا ژیانی نووسەرێک بکەنە دۆزەخ؟، ئەگەر کێشەی پاستێرناک «تەڵە» بووبێ، ئەوانەی تەڵەکەیان تەقاند سێ هێندەی ئەوانە تاوانبارن کە نابوویانەوە.

دەگەڵ ئەوانەش ئەومافە بەخۆدەدەم و روو لەوانە دەکەم کەئەو کێشەیان کۆڵیوەتەوە، داخۆ کێشەی پاستێرناک و خەڵاتی نوبێڵە ەی دوای بەخشینی ئەو خەڵاتە بەئیسحاق رابین و یاسر عەرەفات و نەجیب مەحفوزو...

- بەچاو پۆشین لەبواری کار کردنیان- بێ بەشکردنی نووسەری بەهەیبەت و و داهێنەرو ئینسان دۆست یەشار کەمالی گەورە تیشکێک نەکەوتۆتە سەر هۆیە سیاسییەکانی ئەو خەڵاتە. هەرچەندە تائێستا خەڵاتی نۆبێڵ شان وشەوکەت و بەهای خۆی وەک دیارترین و بەنرخترین خەڵاتی سەرانسەری دنیا ون نەکردوە.

* * *

برای وەرگێڕ شارەزاییەکی فراوان و ئەزموونێکی دوورو درێژی هەیە لەبەکارخستنی زمانی کوردیدا. بەڵام وەرگێڕ ئەگەر بکرێ بڵێین «ئەو دیلەیە کەبە ئازادی بیر دەکاتەوە». دەنێو کوردان زمانزانی چاکن هەن. مەخابن وەرگێڕی چاکن کەمن.

* دەتوانیین بڵێین جۆر وسینتاکسی رستەو پێکهاتی وشە لەو کتێبەدا لە سادەترین و ئاسانترین جۆری وەگەڕ خستنی زمانن. نە رستەو نەپێکهاتەی زمان و نەدارشتەی بواری فرە واتاییان تێدا نییە. بەڵام شاعیری بەنرخمان مامۆستا «فەرهاد شاکەلی» هێندە بەتووندی لەپرۆسەی بە «کوردی کردن»ی رستەکاندا قوڵ بۆتەوە کارەکەی سەخت کردووە. بەتایبەتی لەو شوێنانەی ویستویەتی «کوردی پەتی بخولقێنێ» ئەوەش تووشی هێندێ دارشتەی رەقی کردووە. وەک ژوورە تاکانە ل٢٣، لەپیانۆ دەدرا ل٢٣، چای سەماوەر دەخورایەوە ل٢٣ میوانان و دۆستان، وەک ئاگاداریدەر کار دەکات ل٥١....

کورد دەڵێ: پیانۆ لێ دەدرا، میوان ودۆستان.... تاد.

* بیرکردنەوە بەونەفەس توندییە کاری وەرگێڕان دەخاتە نێو خانەی ئەستەمەوە کورد بیرەکان سادە دادەرێژێ. واتا لەپێکەوە گرێدانی ئەو هەموو وشانەدا ون دەبێ.

* پەنا دەبەمەبەر پەروازی بیر هێنەرەوەی بێهومێدانەی لەخۆبووردن ل٣١

* پێم وایە دەتوانم ئەو مەسرەفەی بەهۆ لای کەمی داوا کارییەکەی سەرەوە پەیدا دەبێ بە ئاسانی بدەم. ل٣١

* بەگشتی وەرگیرانێکی تەواو سەرکەوتوو بەزمانێکی سفت ونەرم دێتە بەرچاو.

هیواردارم مامۆستا زوو زوو بەوبەرهەمانە شادمان کات.

* بۆ کورد

* دەگەڵ هەموو چەرمەسەرییەکانی ژیانی پاستێرناک، دەگەڵ هەموو نەهامەتییەکانیدا، هێشتا پاستێرناک لەبەختەوەرترین ودڵشادترین نووسەری کورد چاترە.

* دەبا پێکەوە تێر بگرین بۆ پاستێرناک نا، بۆ ئەو کوردە رووتەی تا سەد ساڵی دیکە بۆی نییە خەون بەنوبێڵەوە ببینێ.

* دەبا پێکەوە تێر بگرین بۆ پاستێرناک نا، بۆ ئەو کوردە رووتەی تا ئێستا لەسەر ئیدیولوژیانا، لەسەر توێکڵەکەی یەکتر دەکوژن.

* دەبا تێر بگرین بۆ ئەو دکتۆر و پرۆفیسۆر و نووسەرو زانا قەبانەی کورد کە لەسەر ئیدیۆلۆژیانا، لەسەر توێکڵەکەی یەکتر ناخوێننەوە.

# زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
## ساڵی ٢٠٠٢

| زنجیره | ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ١٤٢ | هارون‌و چیرۆکی دەریا | سەلمان روشدی | ئامانج عەزیز کەند |
| ١٤٣ | کارەکەر | گەلاوێژ | |
| ١٤٤ | ژنی کورد لە دەوازەی هەزارەی | کازیوە ساڵح | |
| ١٤٥ | هونەری بێژەری لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا | حەسەنی شەیدا | باسط حەمە غەر |
| ١٤٦ | چارەنووسی گەلی کورد لە کۆنگرەو ... | ئەحمەد باوەڕ | |
| ١٤٧ | پرۆگرامی مایکرۆسۆفت ئۆفیسی ... | شوان مستەفا عیسا | |
| ١٤٨ | زاکیرەی با | ئەحمەدی مەلا | |
| ١٤٩ | قوربانی | کورتزیۆ مالا پارتێ | ئەبوبەکر خۆشنا |
| ١٥٠ | فەرهەنگی شیرین (بەرگی دووەم) | فاضل نظام الدین | |
| ١٥١ | خۆم..ئەو وەختەی باڵندەم! | شێرکۆ بێکەس | |
| ١٥٢ | دەروازە (دەفتەری‌دووەم) | | هەڵکەوت عەبدو |
| ١٥٣ | ژنێ لەبەردەم وەرزێکی ساردا | | ئازاد بەرزنجی |
| ١٥٤ | ژیان | | ئا: رەفیق ساڵح |
| ١٥٥ | فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی...... | بەختیار سەجادی<br>محەمەد مەحموودی | |
| ١٥٦ | یاداشتەکانی مەئمون بەگ... | | صەلاح نەقشبەن |
| ١٥٧ | هەڵبژاردەیەك لە گۆرانی فۆلکلۆری ... | | ئا: فاروق حەفی |
| ١٥٨ | پێوەندی مەسەلەی کورد بەیاسا ... | | ئا: د.مارف عوم |
| ١٥٩ | جیهانی سۆفیا | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ١٦٠ | مێژووی شاری هەولێر ... | یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی | |
| ١٦١ | ئازادکردنی مێژوو | مەهاباد قەرەداغی | |
| ١٦٢ | نووسینەکانم لەبواری ڕەخنەولێکۆڵینەوە | حسێن عارف | |

| | | |
|---|---|---|
| مێـژووی ٦٤١ سـاڵەی فـەرمانڕەوایی ئەردەڵانییەکان... | عەلی نەقی ئەلحوسەینی | ئاسۆس هەردی |
| ناودارانی کورد | میر بەسری | عەبدول خالق عەلائەدین |
| بۆ نەوەکانتانی بگێڕنەوە | ستیڤن بروکفیلد و پۆل ئە. لیڤن | ئیبراهیم خ. ئەحمەد |
| کورد و کەرکوک | | ئا: لەتیف فاتیح فەرەج |
| نەژادی کورد لە لوبنان | خەلیل محەمەد شلْماشی | |
| ژەنەراڵ شەریف پاشا | د. فەرهاد پیرباڵ | |

نرخی (١٠) تەنها دە دینار